ح

له بڵاوكراوەكانی ڕۆژنامەی كۆمەڵ
ژمارە (١)

# كۆمەڵی ئیسلامیی

## ئـــامانج و هەڵوێستەكانی
## و
## چەند پرسیار و وەڵامێكی گرنگ
## لە بارەی ئیسلام و ئیسلامی یەكانەوە



چاپی یەكەم

١٤٢٢ ك ٢٠٠٢ز

لە بڵاوکراوەکانی ڕۆژنامەی کۆمەڵ

(١)

# کۆمەڵی ئیسلامیی ئامانج و هەڵوێستەکانی

## و

## چەند پرسیارو وەڵامێکی گرنگ لە بارەی ئیسلام و ئیسلامیەکانەوە

کۆنگرە ڕۆژنامەوانییەکەی بەڕێز مامۆستا عەلی باپیر ئەمیری کۆمەڵی ئیسلامیی لەشاری هەولێر لەڕۆژی دووشەممە ٢٣/ شوال - ١/٧

چاپی یەکەم

١٤٢٢ك ٢٠٠٢ز

بسم الله الرحمن الرحيم

فَبَشَر عبادِ الذين يَسْتمِعون القولَ فيتَّبِعون أحْسَنَهُ، أولئك الذين هداهم اللهُ وأولئك هم أولوا الألباب. (الزمر: ١٧- ١٨).



کۆنگرە رۆژنامەوانییەکەی
بەڕێز مامۆستا عەلی باپیر ئەمیری کۆمەڵی ئیسلامیی
لەشاری هەولێر لەرۆژی دووشەممە ٢٣/ شوال - ١/٧

## پێشکەش بێ

**بەو عاقڵ مەندانەی گوێ بۆ قسەی هەموو کەس دەگرن، پاشان سەرجەم قسەکان هەڵدەسەنگێنن و لەبێژینگیان دەدەن و، کامەیان چاکتر بوو بێ سێ و دوو هەڵی دەبژێرن و وەری دەگرن.**



کۆنگرە رۆژنامەوانییەکەی
بەڕێز مامۆستا عەلی باپیر ئەمیری کۆمەڵی ئیسلامیی
لەشاری هەولێر لەرۆژی دووشەممە ٢٢/ شوال - ١/٧

## ئەم نامیلکەیە

**خوێنەرە بەڕێزەکان:**

ئەم نامیلکەیە بریتییە لەنێوەڕۆکی کۆڕێکی ڕۆژنامەوانی کە لەڕۆژی ٢٣/شوال/ ١٤٢٢ بەرانبەر ٢٠٠٢/١/٧ لەبارەگای مەڵبەندی هەولێری کۆمەڵی ئیسلامیی بۆ بەندە سازکراو زۆربەی هەرەزۆری کەناڵەکانی راگەیاندنی لایەنە سیاسییەکانی کە لەو دەڤەرەدا هەن تێیدا بەشداربوونو، جگە لەو بابەتەی کە وەك پێشەکی پێشکەشم کردو چەند مەسەلەیەکی گرنگی گرتبوونە خۆ، چەندان پرسیاری جۆراوجۆریش کە لەسوورگەی هەلومەرجی سیاسیی و فیکریی ئێستای کوردستانو عێراقو دەوروبەرو دنیاش دا دەسووڕێن، بەڕوونی وەڵام درانەوە.

شایانی باسیشە کەبرایانی بەڕێزی راگەیاندنی کۆمەڵ بەشی (ڕۆژنامەوانی) ئەرکی لەکاسێتەوە هێنانە سەر قاقەزو ڕێکخستنو تایپ کردنییان کێشاوە، خوا پاداشتی بەرزیان بداتەوەو دەستیان خۆش بێت، دیارە پاشان خۆیشم چاوم پێدا خشاندۆتەوە. بەڵام مەگەر چۆن دەنا هیچ جۆرە دەستکارییەکم نەکردووەو وەك خۆی (کە بەکامێرای ڤیدیۆ تۆمارکراوە) هێڵراوەتەوە. هیواداریشم کەئەم بەرهەمەم بەهەرسێك جۆری بیستراویی و بینراویی و خوێنراوەییەوە خوای زاناو بەخشندە بیکاتە مایەی بەرچاوروون بوونەوەی کەسانێك کەعەوداڵو شەیدای حەقیقەتنو، ببێتە هۆکاری رەواندنەوەی تەمومژی گەلێك گومانو تۆمەت کەلەبارەی ئیسلامو ئیسلامییەکانەوە بڵاودەکرێنەوە.

**لەکۆتاییش دا دەڵێم:**

بێگومان من لەو کۆڕەم دا هەوڵم داوە هەرچی دەیڵێم راستو دروستو هەڵقوڵاوی قورئانو سوننەت بێت، جا ئەگەر ئەو ئامانجەم بۆ هێنرابێتەدی

ئەوە فەزڵو چاکەی خاوەنو پەروەردگاری بەخشەرو بێوێنەمە (سبحانە وتعالى)، لەهەر جێیەکیش دا ئەم پێکا بێت ئەوە خەتای خۆمەو بەزیندوویی و بەمردوویش لەهەر هەڵەو کەموکوورییەکم پەشیمانمو داوای لێبوردن لەخوای لێبوردەو بەخشندە دەکەم.

سبحانك اللهم وبحمدك، أشهد أن لا اله الا أنت، أستغفرك وأتوب اليك

ئەحمەدئاوا

٤ ذي الحجة ١٤٢٢ - ٢٠٠٢/٢/١٦

## پێشەکی

سەرلەبەیانی رۆژی ٢٣/ شوال - ١/٧ مەڵبەندی رێکخستنی هەولێری کۆمەڵی ئیسلامیی کۆنگرەیەکی رۆژنامەوانی بۆ بەڕێز مامۆستا عەلی باپیر ئەمیری کۆمەڵی ئیسلامیی لەبارەگای مەڵبەند سازدا. لەم کۆنگرەدا زۆرێك لەکەناڵەکانی راگەیاندنی شاری هەولێر ئامادەبوون، سەرەتا جەنابی ئەمیر تیشکی خستە سەر هۆکارەکانی بونیاتنانی کۆمەڵی ئیسلامیی و بەکورتی ئامانج و هەڵوێستەکانی لەبەرامبەر گۆڕانکارییەکانی عێراق وجیهان وکوردستان روون کردەوە. پاشان دەرگای پرسیار بۆ ئامادەبوان کرایەوەو ئازادانە پرسیارەکانیان ئاراستەی کردو بەڕێز ئەمیری کۆمەڵی ئیسلامییش بەراشکاوی و روونی وەڵامی پرسیارەکانی دانەوە.

**کەناڵە بەشداربووەکانیش بریتیبوون لە:**

- تەلەفزیۆنی مەرکەزی کۆمەڵ
- کەناڵی ئاسمانی کوردستان
- کەناڵی مەرکەزی کوردستان
- تەلەفزیۆنی هەرێم
- کەناڵی هەولێری یەکگرتوو
- رادیۆی یەکگرتوو
- رۆژنامەی یەکگرتوو
- رۆژنامەی هاووڵاتی
- رۆژنامەی میدیا
- رۆژنامەی دەنگی میللەت
- رۆژنامەی پەیامی ئاشتی
- رۆژنامەی پاڵە

سەرەتا لەلایەن بەڕێز کاك زانا سەعید ڕۆستایی ئەندامی شووراو لێپرسراوی مەڵبەندی هەولێرەوە بەخێرهاتنی ئامادەبوانی کۆنگرە ڕۆژنامەوانییەکە کراو مەبەستی کۆنگرەکەی لەوتەیەکی کورتدا ئاشکرا کرد کە بۆ تیشك خستنە سەر هەلومەرجی ئیعلانکردنی کۆمەڵی ئیسلامیی و ئەو ئامانجانەی کەکاریان بۆ دەکات و تێڕوانین و هەڵوێستەکانی بەرانبەر مەسەلە پەیوەندیدارەکانی واقعی کوردو خستنەڕووی دیدی کۆمەڵ بۆ بارودۆخی ئێستاو داهاتووی سیاسی هەرێمی کوردستان و عێراق سازدراوە.

پاشان بەڕێز مامۆستا عەلی باپیر وتەیەکی پێشکەش بەئامادەبووان کرد.

## دەقی وتەکەی بەڕێز مامۆستا عەلی باپیر:

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمدلله والصلاة والسلام على رسول الله محمد وعلى آله وصحبه ومن اهتدى بهداه.

بەخێرهاتنی گەرمی هەموو لایەك دەکەم و خۆشحاڵم بەدیدارتان، لەراستیدا ئێمە وەکو میللەتی کورد لەم هەلومەرجە ناسكو دژوارەی کە میللەتەکەمان پێیدا ڕەت دەبێت، لەهەموو کاتێك زیاتر پێویستیمان بەلەیەکتر تێگەیشتن و دەستبار بۆ یەکتر گرتن و هاوکاری یەکتر کردن هەیە، چونکە بێگومان هەر گەلو میللەتێك شتێکی باشی ئەگەر بۆ بکرێت بەهۆی تەبایی و برایەتی و یەك دەنگییەوە بۆی دەکرێت، هەمیشە تێکگیران و دژایەتی و ناکۆکی و دووبەرەکی هۆکاری هەر جۆرە دواکەوتن و لێکترازان و پەشێویو ئاڵۆزییەکە کە لەنێو هەر گەلو میللەتێکدا دروست دەبێت، بۆیە ئێمەش لەو روانگەیەوە بەپێویستی دەزانین، وەك ئیسلامی هەم خۆمان وەك کۆمەڵێکی ئیسلامیی کە لەنێو ساحەی کوردستاندا کاردەکەین حەز دەکەین زیاتر خۆمان بەخەڵك بناسێنین وەك خۆمان نەك لەدەمی خەڵكو لەروانگەی قەڵەمو پێناسەی خەڵکی ترەوە، خەڵك لەدەمی خۆمانەوەو لەروانگەی خۆمانەوە بمانناسێت کەبێگومان ئەوە حەقیقەتی ئێمە دەبێت کە دەکەوێتە بەرچاویان نەك ئەوەی کە بەچاویلکەی خەڵکیتر یا لەپشت پەردەی خەڵکیتر سەرنجمان لێبدات، رەنگە شتێکی تری بکەوێتە بەرچاو، دەشمانەوێ هەڵوێستو ئامانجی خۆمان و بیروبۆچوونو تێڕوانینی خۆمان سەبارەت بەو بابەتانەی کە جێگەی مەبەستمانن وەپەیوەندییان بەهەموومانەوە هەیە هەڵوێستو تێڕوانینی خۆمان بخەینەڕوو، دیارە لەدوایشدا دەرگای پرسیارو وەڵامیش ئاوەڵا دەبێت بۆ ئەو پرسیارانەیکە پەیوەندیدار دەبن بەو بابەتانەی کەباسی دەکەین.

## یەکەم: کۆمەڵی ئیسلامیی بۆچی؟!

یەکەمین بابەتێك کەمن دەمەوێ تیشکی بخەمە سەر ئەوەیە ئێمە وەك کۆمەڵی ئیسلامیی خۆمان بەدرێژە پێدەری راستەقینەی بزووتنەوەی ئیسلامی پێشووترو بزووتنەوەی یەکبوونی ئیسلامی دەزانین لەهەموو روویەکەوە، تەماشاش دەکەی ئەوە راستییەکی سەلمێنراوە، ئێمە وەك کۆمەڵی ئیسلامیی (٢٦) ئەندامی دەرچووی کۆنگرەی یەکەمی (بزووتنەوەی یەکبوونی ئیسلامی) لەنێو (کۆمەڵی ئیسلامیی) داین لەریزی (٢٩) ئەندامو زۆربەی بنکەو بارەگاکان، مەگەر بەدەگمەن دەنا هەمووی لەژێر کۆنترۆڵی کۆمەڵی ئیسلامیدانە، بەبێ ئەوەی کەزۆرو هێزێك بەکارهێنرابێت، بەڵکو مەڵبەندو هێز و مەکتەب و، زۆربەی ئۆرگانەکان لەکاتێکدا کە کۆمەڵی ئیسلامیی ئیعلان کراوە هەرکەس لەئاست خۆیەوە عەلەمو بەیداخی کۆمەڵی ئیسلامیی بەرزکردۆتەوە، بەبێ ئەوەی کەهیچ جۆرە زەختو زۆرێك بەکاربهێنرێتو، ئالیەتو میکانیزمی ئیعلان کردنی کۆمەڵی ئیسلامیش شتێك بووە کەپێمان وایە ئێمە وەك ئیسلامی لەکوردستاندا تێیدا پێش قەدەم بووین، کە بەهێمنیو بەئارامی بەبێ ئەوەی کەخوێنی تێدا برژێت ئەو پرۆژەیە سەری گرتووە، هەتا پیاوێکی وەکو کاك دکتۆر مەحمود عوسمان شایەتی ئەوەی بۆداینو وتی ئێوە لەو رووەوە لەلایەنە سیاسییەکانی کوردستان، لەبرادەرانی عەلمانی لەپێشتر بوون چونکە توانیوتانە هێمنانەو ئارامانە ئەوە بکەن، میللەتی ئێمە پێویستی بەوە هەیە کاتێك کە لەنێو حزبێکدا لەنێو کۆمەڵێکدا کە دوو رەوت بەیەکەوە دەبن کاتێك دەزانن بەیەکەوە ناگونجێن لەبەر هەر هۆیەك بێت زۆر جێگەی خۆیەتی کە بەلەباریو بەدۆستانەو بەهێمنانە لێك بترازێن، ئەڵبەتە ئێمە وەك کۆمەڵی ئیسلامیی ئەو حاڵەتی ئارامیەمان بەخۆمانەوە بینیوە ئەگەر بەرامبەریش حاڵەتێکی تری پێچەوانەی ئەوەی بەخۆیەوە ببینێت، جا کۆمەڵی

ئیسلامیی بۆیە دروست بوو تا ئەو ئامانجە شەرعیانەی کە کاتی خۆی بزووتنەوەی ئیسلامی بۆ تەحقیق کردنیان هاتە کایەوەو پاشان بزووتنەوەی یەکبوونی ئیسلامی کە لەیەککگرتنیبزووتنەوەی ئیسلامی و بزووتنەوەی راپەرینی ئیسلامی دروست بوو، ئەو ئامانجە شەرعیانەن کە ئەو بزوتنەوانەی بۆ دروست بوون ئەو جموجۆڵە ئیسلامییانەیان بۆ بنیات نرا، بتوانێت تەحقیقیان بکات چونکە ئێمە هەستمان دەکرد کە بزووتنەوەی یەکبوونی ئیسلامی گەیشتووەتە بنبەستێك کە ناتوانێ ئەو ئامانجە شەرعییانە بێنێتەدی بەڵکو بەپێچەوانەوە روو بەگەڕانەوەیە، واتە ئێمە لەرووی شەرعییەوەو لەرووی بەرژەوەندی باڵای ئیسلامو موسڵمانانو میللەتەکەمانەوە خۆمان بەناچار بینی کە کۆمەڵی ئیسلامیی ئیعلان بکەین.

## دووەم: ئامانجەکانمان

**ا) لە رووی فیکری و فەرهەنگییەوە:**

ئێمە لە رووی فیکری و فەرهەنگییەوە ئامانجمان ئەوەیە کە میللەتی خۆمان کەمیللەتێکی موسڵمانە خاوەنی رەسەنایەتی ئیسلامییەو مێژوویەکی دێرینی هەیە مێژوویەکی پرشنگداری هەیە نەخزمەتکردنی ئیسلام و لەبەختەوەربوون وعیززەتمەند بوون بەهۆی ئیسلامەوە چ لە رووی ئەدەبیو فیکرییەوە چ لەرووی مەعریفیو لەروویی عیرفانو تەسەووفەوە چ لەرووی خەباتی نەتەوایەتییەوەو چ لەرووی دابو نەریتی کۆمەڵایەتییەوە لەهەر روویەکی ترەوە میللەتی ئێمە زۆر بەهرەمەند بووە لەئیسلام زۆر بەختەوەر بووە و خزمەتی زۆریشی کردووە بەئیسلام وەکو شەریعەتێكو بەرنامەیەك، میللەتی کوردیش بەهۆی ئیسلامەوە زۆر چۆتە پێش، لەبەرئەوەی کەئەو کاتە

هیچ کیانێکی نەبووە بەرگری لێبکات وە بوونو قەوارەیەکی نەبووە کەپەرۆشی بێ و لەدەستی بچێت شتێکی نەبووە کە بەتەنگیەوە بێت بەڵکو وەك هەموو لایەك ئاگادارین بەتایبەت ئەوانەی کەشارەزایی مێژوون ئەوکاتە کوردستان جێگای تەراتێنو راوراوێنی دەوڵەتی بێزەنتیو دەوڵەتی فارسو ساسانیەکان بووە بۆیە لە حاڵێکدا کە کورد مەزڵومو ماف پێشێلکراوو زەوی داگیرکراو بووە، خوا خوای فریادرەسێکی بووە ئیسلامیش کە هاتووە بۆ ناو میللەتی کورد بۆ هەر میللەتێکی تریش کەهاتووە چاوی لەوە نەبووە کەخۆی بسەپێنێ بە بەڵگەی ئەوە کە لەهەر شوێنێك ئیسلام دەسەڵاتی بووبێت لەخودی خەڵکی ئەو شوێنە کاربەدەستی بۆیان دیاری کردووە وە ئەو میرنشینانەی کە لەکوردستانی ئێمەدا پەیدا بوونو سەریان هەڵداوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەئیسلام دینێکی قەومی نەبووە، کۆمەڵێك بهێنێت بەسەر کۆمەڵێکیتردا فەرزی بکات بەڵکو بەرنامەی خوایە بۆ هەموو بەندەکانی خوا لەهەر رەگەزو گەلو نەتەوەیەك بن، ئێمە لەگەڵ ئەوەداین میللەتی خۆمان ئەو رەسەنایەتیە کەبوویەتی بیپارێزێت بەڵکو لەو لایەنانەوە کەلاواز بووە بیبووژێنێتەوە چونکە میللەتی بێفەرهەنگو بێمێژوو بەخەڵکی بێریشەو بێئەسڵو بێ بنەچەکە دادەنرێت، ئیسلامیش فەرهەنگێك وئاینێك نییە کەمیللەتی ئێمە تەبەرای لێبکاو حاشای لێبکات و خۆشبەختانە هەموو برادەرانی سیاسیش، سەرکردە سیاسیەکانیش نکوولیان لەوەدا نییە کە میللەتی کورد میللەتێکی مسوڵمانەو لەسایەی ئیسلامیشدا بەهرەمەند بووەو ئەگەر جارجار کەمو کورتیش هەبووە لە جێبەجێکردنی ئیسلامدا.

**ب ) لە رووی سیاسییەوە:**

ئێمە لە رووی سیاسییەوە دەمانەوێ کە میللەتی موسڵمانی کوردستان حاڵەتێکی سروشتیو شەرعی وای هەبێت کە پێکەوە دۆستو براو تەبا بێت و دابەش نەبێت بۆ زاڵمو مەزڵوم، حاکم زۆردارو دیکتاتۆر نەبێو خەڵکو هاووڵاتیش ماف پێشێلکراو و چەوساوەو دەنگ کپکراو ماف زەوتکراو، چونکە هەرکاتێك میللەتان دابەش بوون بۆ زاڵمو مەزڵوم، زاڵمێك کەخۆی لەحاکمو دەسەڵاتداردا دەبینێتەوە مەزڵومێك لەمیللەتو رەعیەتدا خۆی دەبینێ، ئەوە ئەو میللەتە بەدواکەوتوو لەقەڵەم دەدرێو بێگومان ناتوانێت مەرامو مەبەستە رەواکانی بەدەست بهێنێتو لەبەرامبەر داگیرکەرانیشدا توندیی و تۆکمەیی نابێت بەڵکو هەر کامێکیان لەخەڵکو میللەت کە زوڵمی لێدەکرێت کە وەك ئەو پەندە کوردییە کە دەڵێ چ گورگ بتخوات چ رووبار بتبات کابرا کەزوڵمی لێبکرێ لەلایەن حاکمێکی خۆماڵی یان داگیرکەرێك رەنگە فەرقێکی وای پێنەکات. بۆیە ئێمە وەك ئیسلامی بەگشتیو بەتایبەتی وەك کۆمەڵی ئیسلامیی پێمان وایە کە ئەوە خزمەت بەمیللەتی کورد دەکات کە شێوەیەك لەحوکمڕانی شێوەیەك لەسیستم حاکم بێت کە رێز لەئیرادەی میللەتو جەماوەر بگرێت، میللەت ئەو سیستەمە ئەو حوکمە بەهی خۆی بزانێت خۆی بەخاوەن بەش بزانێت تێیدا ئەگەر هەر مەترسیەك رووی لەوڵاتو مەملەکەت کرد وا بزانێت دیفاع لەماڵی خۆی دەکات، بێگومان ئێمە پێشمان وایە کە ئەوە کاتێك دەبێت ئەو سیستەمو حوکمە حاکم بێت کە خوا ناردوویەتی چونکە دینی خوا بۆ هەموو بەندەکانی هاتووە و بێگومان جیاوازی ناخاتە نێوانیانەوە.

**ج ) لە رووی ئەخلاقی و کۆمەڵایەتییەوە:**

ئێمە لە رووی ئەخلاقیو کۆمەڵایەتییەوە، سوپاس بۆ خوا، بەراورد لەگەڵ میللەتی ئەوروپاو میللەتانیتر کەتووشی داڕووخانی ئەخلاقیو

لێکپچڕانی شیرازەی خێزان و نەمانی سیلەی ڕەحم و بەزەیی و پەرۆشی و ڕێز و ئیحتیرام لەنێو یەکتردا بوون بە بەراورد لەگەڵ وان وەزعی ئێمە زۆرباشە، بەڵام بێگومان کۆمەڵێك دیاردەی خراپ و کۆمەڵێك نەخۆشی کۆمەڵایەتی و ئەخلاقیمان لەنێودا پەیدابوون و ڕەنگە ڕوو لەگەشەکردنیش بن ئێمە وەکو کۆمەڵی ئیسلامیی بەئەرکی سەرشانی خۆمانی دەزانین کە بەربەستێك دروست کەین کە ڕێ لەوجۆرە نەخۆشیانە لەو داڕوخانی ئەخلاقی و لەو پچڕانی شیرازەی کۆمەڵایەتییە بگرێ، ئەوەش بەوە دەبینین کەفەرهەنگی ئیسلامی و ئەخلاقی ئیسلامی و ئادابی ئیسلامی لەنێودا زیاتر برەو و گەشەی پێبدرێ و سەقام گیر بێت.

**د) لە ڕووی ئابووری وگوزەرانەوە:**

ئێمە لەڕوویی ئابووری و ژیان و گوزەرانیشەوە یەکێك لەئامانجەکانمان ئەوەیە کە میللەتی ئێمە حاڵەتێك لە ژیان و گوزەران بەخۆوە ببینێت کە لەڕووی ئابوورییەوە قڕی و پڕی و چینایەتی نەبێت، ڕاستە لەئیسلامدا دان هێنراوە بەخاوەنیەتی تاکدا بەڵام خاوەنداریێتی تاك لەسەر حیسابی بەرژەوەندی گشتی درووست نییە بۆیە لەئیسلامدا هەموو ئەوجۆرە موعامەلانەی زیانی کۆمەڵیان تێدایە ڕێیان لێگیراوە، وەك سوو خۆریی و داگیرکردن (غصْب) و بازرگانی بەو شتانەوە کەزیانبەخشن بۆ خەڵك، وەك مادە سەرخۆشکەرەکان، چونکە لەوانەیە لەم شتانەدا تاك قازانج بکات بەڵام کۆمەڵ زەرەر دەکات، وەلەئیسلامدا کۆمەڵێك شت کراون بەموڵکی گشتی، درووست نییە بکرێن بەموڵکی تایبەت وەکو پێغەمبەری خواﷺ لەفەرمووده‌یەکدا کە ئەبوداود دەیگێڕێتەوە دەفەرموێت: (الناس شركاء في ثلاث، الماء والكلء والنار وفي رواية والملح) واتە خەڵك لەسێ شتدا هاوبەشن دروست نییە بکرێن بەموڵکی تایبەت (ئاو، ئاگر، پاوان و لەوەڕگا لەریوایەتێکیشدا دەفەرموێ خوێش) زانایانی ئابووری ناس لەئیسلامدا

دەڵێن ئەم فەرمودەیە بنەمایەکە بۆ هەر شتێك کە خەڵکی بەگشتی پێویستیان پێیان هەبوو ئەوە نابێت بکرێتە موڵکی فەردیو شەخسی بەڵکو پێویستە موڵکی هەموو میللەت بنو خوای دادگەر زۆر بەڕاشکاوی لەسورەتی حەشردا رایگەیاندووە کە سەرمایەداری لەئیسلامدا نییە، دەفەرموێ: (کی لایکون دولة بین الأغنیاء منکم..) واتە: با ماڵو دارایی لەدەستی دەوڵەمەندەکاندا کۆنەبێتەوەو کورت هەڵنەیێ، چونکە کاتێك سەروەتو سامان هەموو بکەوێتە دەستی دەوڵەمەندەکان بێگومان ئەوکاتە چینی هەژارو نەدار چەوساوە دروست دەبێت وەك لەئەوروپاو رۆژئاوادا دەیبینین. هەرچەندە ئێمە کاتی خۆی لەگەڵ برادەرانی شیوعی و مارکسی زۆر مشتومڕمان دەبوو لەسەر ئەوانە بەڵام بەداخەوە ئێستا لەکوردستاندا ئەوە هەر لەبیرچۆتەوە چونکە بەڕاستی کاتی خۆی بلۆکی رۆژهەڵات لەکاردانەوەی سەرمایەدارییدا دروست بوو، یەکێتی سۆڤیەت لەسەر کۆمەڵێك بنەما درووست بوو کە هەندێك لەو بنەمایانە، وەك چینایەتی نەبێت، قڕیو پڕی نەبێت، ئەو شتانەی کە گشتین لەدەستی تاکدا کورت هەڵنەیەت کەبێگومان ئەوانە لە روحی ئیسلامەوە زۆر لە سیستەمی سەرمایەداری نزیکترن بەڵام ئێستا لەژێر کاریگەریی فەرهەنگی رۆژئاوادا ئەو شتانە هەمووی لەبیرچوونەوە خەڵك هەمووی رووی کردۆتە ئەو بەها (قِیَم)و چەمکانەی کە لەرۆژئاواو جیهانی سەرمایەدارییەوە دێن، وەکو حەقایقی رەها (الحقائق المطلقة)ش وەردەگیرێن، لەحاڵێکدا کە پێش (١٠-١١) ساڵ پێش ئێستا کەسێك باسی ئەمریکاو باسی سیستمی کاپیتالیزمیو باسی جیهانی سەرمایەداری کردبایە دەیانگوت هەر لە بنیادەمیش شۆڕاوە!.

## سێیەم: هەڵوێستەکانمان

**أ ) مەسەلەی کورد:**

سەبارەت بەمەسەلەی کوردو هەڵوێستمان بەرانبەری، ئێمەی کورد وەکو میللەتێك لەهەموو میللەتانی دنیا تەماشا دەکەین کورد کەبەداخەوە هەتا ئێستا ئامارێکی ورد نییە لەسەر ژمارەی کورد کەئەوەش یەکێکە لەمەزڵومییەتەکانی کورد، بەهەرحاڵ پێمان وایە کەلە چل ملیۆن کەمتر نییە، ئێمە وای تەماشا دەکەین کەیەکێکە لەو میللەتانەی کەخوا خوڵقاندوودوویەتی لەسەر زەوی‌و نیشتمانێکی هەیە پێی دەگوترێ کوردستان، کوردیش میللەتەو هیچیشی کەمتر نییە لەمیللەتانی‌تر وەك تورك‌و عەرەب‌و ئینگلیزو لە باقی ئەو میللەتانە؛ لەرووی شەرعییەوە کورد حەقی خۆیەتی لەنیشتمانی خۆیدا ئازاد بێت سەربەخۆ بێت لەخێرو بێری وڵاتەکەی بەهرەمەند بێت‌و کەس لەهیچ روویەکەوە نەیچەوسێنێتەوە، ئەوە بەگشتی بۆچوونی ئێمەیە پێشمان وایە دۆزی میللەتی کورد زۆرجار کراوە بەوەرەقە بۆسەر ئەملاو ئەولا بەدەست دەوڵەتانی ئیقلیمییەوەو دابەش بوونی کوردیش بەشێوەیەکی رەسمی کە کرا بەچوار پارچەوە بێگومان ئەوە بەرهەمی شومی پەیمانی سایکس بیکۆیە کەشاردراوە نییە کە لەنێوان زلهێزەکاندا مۆرکراوەو کەم تا زۆر ئیسلام دەستی لەوەدا نییە، بەڵکو ئەگەر ئیسلام حوکم بکاو بگونجێت لەسەرتاسەری جیهان دەسەڵاتی ئیسلامی هەبێت کوردستانیش ویلایەتێك دەبێت وەکو کاتی خۆی ناوچەکان بەوشێوە دابەش کراون میسر ویلایەتێك بووە بیلادی جەزیرەو ویلایەتێك بوو، شام ویلایەتێك بووە، ئەگەر ئەوەش نەبێت کورد بەهەموو کێشانەو پێوانەیەك هەقی خۆیەتی کەکیان‌و بوونێکی هەبێت بەشێوەیەك کە

بۆی دەگونجێت و بەبەرژەوەندی دەزانێت هەر لەدەوڵەتی سەربەخۆ یان بەشێوەی فیدراڵی بێت یان هەرچۆنێك لەڕووی شەرعییەوە بۆی هەیە بەڵام چەندی بۆ دەگونجێت لە واقیعدا ئەوە شتێکی‌ترە.

**ب) قەوارەو ئەزموونی کوردستانی عێراق:**

حاڵەتی ئێستای کوردستانیش کە کاتی خۆی یەك ئیدارەو یەك پارچە بوو، بێگومان بەرهەمی خەبات و تێکۆشانی چەند ساڵەی میللەتەکەمان بوو کە قوربانی زۆر لەوپێناوەدا درا، ئێمە ئەو ئەزمون و کیان و قەوارەیەی کەهەیە بەئاواتێکی لەمێژینەی میللەتی کورد دەزانین هەرچەندە هەتا ئێستا لەڕووی سیاسیەوە لێیان نەسەلماندوین و بەداخەوە مامەڵەی ئینسانیمان لەگەڵدا دەکەن کەئەوەش زوڵمێکە لەم میللەتە دەکرێت بەڵام بەهەرحاڵ ئێمە دڵمان پێی خۆشە و وەك ئیسلامی خۆمان بەخاوەن بەش دەزانین تێیدا لەبەرئەوەی هەم پێش ڕاپەڕین هەم دوایی ڕاپەڕین هەم لەکاتی ڕاپەڕیندا ئێمە ئەوکاتە لەژێر ناوی بزووتنەوەی ئیسلامیدا شەهیدو قوربانیمان داوەو بەشداربووین لەگەڵ هەموو موعانات و ئێش و ئازاری میللەتەکەی خۆماندا و ئەو شتانەی کە کراون هەمووی بەشداربووین تێیدا بەوەندەی کە بۆمان ڕەخساوەو توانیومانە بۆیە ئێمە خۆمان بەخاوەن بەش و پشك دەزانین لەم کیان و قەوارەیەدا بەڵام ئەوەی کەبۆتە داخ و کەسەر لەسەر دڵی ئێمە ئەوەیە کەئەم قەوارەیە بۆتە دوو لەت کەئەوەش بەشتێکی خراپی دەزانین. بۆیە پێویستە هەوڵبدرێت بۆئەوەی ئەو دوو ئیدارەیە بخرێنەوە سەریەك و یەك ئیدارەو کیان و قەوارەی توندو تۆڵ بین، هەم ڕێگە لە دەست تێوەردانی ئیقلیمی دەگیرێت لەحاڵەتێکی وادا، بەلای کەمەوە بیانوویان نابێت و ئەگەر دەست تێوەردەن زیاتر زەق دەبێتەوە هەم بەم وەزعەش کەلەئارادایە تۆمەتبارمان دەکەن بەوەی کە کورد

ناتوانێت ئیدارەی خۆی بکات، کەبڵێن ئەوەتا گەلی کوردستان کیان و قەوارەشیان هەیەو ئازادیشن کەچی ناتوانن پێکەوە بسازێن مەدار بکەن! وەهەم بیانووی دەوڵەتانی رۆژئاواش دەبڕین کە بڵێن کورد هەر دەستی لەیەخەی یەکتردایە بۆیە ئێمە دەڵێین بەکەڵکی کیان و دەوڵەت نایەت!! هەموو ئەو بیانووانەی دەبڕین و بێگومان میللەتەکەشمان رۆژانی مەینەتی تاڵی یەکتر کوژیو یەکتر ڕەتاندنی بۆ دووبارە نابێتەوە، لەو رووەشەوە ئاواتێکی ئێمەیەو ئامانجی ئێمەیە.

ج) مەسەلەی تیرۆرو تۆقاندن:

سەبارەت بەکێشەی تیرۆرو ئیرهابو توندوتیژی کەبەداخەوە زۆرجار بەناحەق ئیسلام بەوە تۆمەت بار دەکرێت کە ئیسلام بڕوای بەتیرۆرو ڕەشەکوژی هەیەو ئیسلامییەکان بەوە تۆمەتبار دەکرێن کەتیرۆریستن، ئیسلام بەوە تۆمەت بار دەکرێت کەسەرچاوەی ئیرهابە ئێمە هەر بەکورتی لەوبارەوە دەڵێین: بەڕاستی ئەوانە هەمووی لەپشت پەردەی ڕەش تەماشاکردنی ئیسلامە، بەڵام خۆشبەختانە ئێستا لەرۆژئاواو بەتایبەت لەئەمەریکا دام و دەزگاکانی راگەیاندن بیانەوێو نەیانەوێ ناراستەوخۆ دان بەوەدا دەنێن کەئیسلام لەو شتانە بەرییە، کە دەڵێن فلان کەسە تیروریستە، بەڵام ئیسلام دینی سەماحەتو عەدالەتو ڕەحمەتو بەزەییە ئەوە شتێکی باشە، کەرەنگە ئەوە ناراستەوخۆ بانگەشەیەکی باش بێ بۆ ئیسلام، کەمادام ئیسلام شتێکی باشە، بەڵام فلان کەس کارێکی هەڵەی کردووە، با لێکۆڵینەوە بکەین بزانین ئەو دینە چییە کەوا خەڵك ئەوەها باسی دەکا!! جا لەو بارەوە من هەر بەکورتی دەڵێم: کە ئەگەر هەر فیکرەیەك بگونجێ بەزۆر بسەپێنرێت بەسەر خەڵکیدا ئەوا ئیسلام ناگونجێت بەزۆر بسەپێنرێت. چونکە ئیسلام بەرلەوەی کاری لەگەڵ رواڵەتی ئینسانو لەگەڵ جەستەو دەرەوەی ئینساندا بێت، سەروکاری لەگەڵ دڵو دەروونو عەقڵو بیرو هۆشی

ئینسانە، چونکەلەئیسلامدا هیچ کردەوەیەك بەبێ نییەت بەرناکەوێت (أنما الأعمال بالنیات) هەموو کردەوەکان بەنییەتن، وەکو پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی و بوخاری و موسلیم گێراویانەتەوە، هەر کردەوەیەك بیکەی‌و نیەتت بۆ خوا نەبێت بەرناکەوێت، نیەتیش لەدڵدایەو بەس خوا پێی دەزانێت، کەواتە کابرایەك کەنوێژ دەکات ئەگەر نوێژەکەی بەدڵسۆزی و لەدڵ‌و دەروندا بۆ خوا نەبێت لەجیاتی ئەجرو پاداشت سزا دەدرێت چونکە بەریابازو دووڕوو لەقەڵەم دەدرێت، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: (فویل للمصلین الذین هم عن صلاتهم ساهون .. الذین هم یراؤن...).

واتە: سزای سەخت بۆ ئەو نوێژکەرانەی کە لە نوێژەکانیان بێئاگان، ئەوانەی کە ڕیابازیی دەکەن. بەڵێ ئیسلام ناگونجێت بسەپێنرێت بەسەر خەڵکیدا، چونکە ئەگەر بەزۆر ڕۆژووت پێگرت، دەیکەیت بە مونافیق‌و ئەگەرکەسێك بەزۆر هەر تاعەتێکت پێ‌ئەنجامدا لەجیاتی پاداشت سزای لەسەر وەردەگیرێت، ئنجا ئیسلام نەهاتووە خەڵك فێرە ئیزدیواجییەت‌و دووڕوویی بکات، بڕوای بەخواو بەئیسلام‌و نوێژ نەبێت‌و بەڵام پێی بڵێ هەر دەبێ بیکەیت!! خوای پەروەردگار بەراشکاوی فەرموویەتی: (لاإکراه في الدین) تۆپزی‌کردن‌و زۆرە ملێ لەدیندا نییە، خوا کەپەروەردگاری خەڵکییەو دینی خۆی کەتاقە بەرنامەی حەقە ڕێی نەداوە بەزۆر بسەپێنرێ بەسەر خەڵکدا! ئینجا کەسانێك دەڵێن ئیسلام ئەگەر دەوڵەتی بوو دەسەڵاتی بوو چ دەکات؟ ئێمە ئەگەر تەماشای مێژوو بکەین بەدرێژایی مێژووی دەوڵەتی ئیسلامی چ لەسەردەمی پێغەمبەر ﷺ چ لەسەردەرمی چوار خولەفای ڕاشیدین ئەمەوییەکان عەباسییەکان و عوسمانییەکان هەرچەندە لەسەردەمی عەباسی‌و ئەمەوی‌و عوسمانییەکاندا مومارەسات‌و غەڵەتی زۆر بووە بەڵام لەوکاتەوە کە دەوڵەتی ئیسلامی دامەزراوە هەتا کۆتایی پێهاتووە، کەمایەتییە دینییەکانی تێدا بوون بەئازادی، جوولەکەو نەسرانی‌و

زەردەشتی بوون و هەموویان بەئازادی ژیاون کەسیش پەرستگاکانیانی نەروخاندووە، هیچ مافێکیان زەوت نەکراوەو هیچ دەست درێژیشیان نەکراوەتە سەر وە ئەگەر موسڵمانێك بەهەڵە شتێکی بەرامبەر کردبن لە لایەن دەوڵەتی ئیسلامییەوە موحاسەبە کراوە ئیمامی عەلی خوا لێی رازی بێت لە قسەیەکیدا دەفەرموێت: (انما بذلوا لنا أموالهم حتى تكون دماءهم كدمائنا وأموالهم كأموالنا) بۆیە کەمایەتییە دینییەکان سەرانەیان داوە هەتاوەکو خوێن و ماڵیان وەك هی ئێمەی لێ بێت، ئیسلام لە لوتکەی دەسەڵاتیدا تەنها داواکاری و تەکلیفێك کە لەغەیری خۆی دەیکات، واتە ئەوانەی کە بڕوایان بەئیسلام نییە بەڵام لەژێر دەسەڵاتی ئیسلامدا دەژین و هاووڵاتین، تەنها تەکلیفێك کەلێیان دەکات، ئەوەیە کە زیانی لێنەدەن و دژایەتی نەکەن، بەڵام ئازادن لەبواری ئەحوال شەخسی و موعتەقەدات وشتی شەخسی خۆیاندا ئازادن، کابرا نەسرانییە جولەکەیە زەردەشتییەو بڕوای بە هەر شتێکەو هەر فیکرەیەکە، بەڵکو رەئی هەرەبەهێزی زانایان ئەوەیە کە مولحیدو بت پەرست وموشریك هەرکامیان وەك ئەهلی کیتاب دەتوانێت لەسەر دینی[1] خۆی بێت و هیچ کەسیش بۆی نییە زۆری لێبکات. بۆچی؟ لەبەرئەوە خوای پەروەردگار فەرموویەتی: (لا اكراه في الدين) و هەروەها فەرمویەتی (فمن شاء فليؤمن ومن شاء فليكفر) کێ پێیخۆشە بائیمان بهێنێت کێش پێی خۆشە با کافر بێت، ئەگەر کافریش بوو بەڵام هاووڵاتی بوو دەبێ دینی پارێزراو بێت، دەبێت ماڵ و سامانی کەرامەت و ناموسی پارێزراوبێت، ئازادییە شەخسیەکانی دەبێ پارێزراو بن لەسنوری دەستووری وڵاتدا کە شەریعەتە، تەنانەت زانایان دەفەرموون دورست نییە موسڵمان غەیبەتی کابرای جوولەکە و زەردەشتی

---

[1] وشەی (دین) بەمانا زمانەوانیی و راستەقینەییەکەی هەر بەرنامەو ڕێبازێکی راست یان چەوت، خوای پەروەردگار ناردبێتی یان مرۆڤ دایناب‌ێ دەگرێتەوە ئێمەش لێرەدا بەو واتایەی بەکارمان هێناوە.

بکات، چونکە مادام هاوولاتییە لەهەموو روویەکەوە دەبێ مافی پارێزراو بێت. کەواتە مەسەلەی تیرۆرو توندوتیژی و ئیرهاب لەراستیدا تۆمەتێکە دەدرێتە پاڵ ئیسلام، پێغەمبەر ﷺ دەوڵەتی ئیسلامی لەمەدینە دامەزران بەبێ‌ئەوەی یەك دڵۆپە خوێن برژێت دوایی ئیسلام کەپەنای برده بەر چەك و هێز بۆ پارێزگاری لەو دەوڵەتەو لەوکیانە بوو کە بەئیرادەی ئازادی خەڵکی دامەزرا بوو، خەڵکی مەدینە خۆی حەزی بەئیسلام کردو گوتیان دەبێ ئیسلام حاکم بێت، بۆچی لەمەککە پێغەمبەر ﷺ دەوڵەتی دانەمەزراند چونکە خەڵکی مەککە ئیسلامیان نەدەویست، کەمێك ئیمانیان هێنا بوو بەلام زۆربەیان پێیان رەفز بوو، پێغەمبەر ﷺ کۆچی کردو بەجێی هێشت، بەڵێ دوایی مەککەو شوێنەکانی تریشی هەمووی ئازاد کرد، بەلام نەك بۆئەوەی ئیسلامیان بەسەردا پسەپێنێت بەڵکو بۆئەوەی بەیداخی (لا اله الا الله محمد رسول الله) بشەکێتەوە، ئەوکاتە کێ ئیمان دەهێنێت بابهێنێت کێش نایهێنێت ئازادەو لەسایەی دەوڵەتی ئیسلامیدا سەروماڵیشی پارێزراوە. کێشەی ئیرهاب و توندوتیژی ئەویش دوو حاڵەتی هەیە، کەسێك دیفاع لەمەزڵومیەتی خۆی بکات پێویستە لەسەری توندوتیژ تۆکمەو توندوتۆڵ بێت، کوردەواری خۆمان دەڵێت: (لەبەرامبەر مستێ دەبێ درێشێ رابگری) چونکە دیفاع لەخۆکردن، خوای گەورە لەبچوکترین مەخلوقدا ئەو هەستەی خوڵقاندوە بۆ نموونە کرمێکی زۆر بچوکیش دەرزیەکی پێدابکەی خۆی رێك دێنێ هەوڵ دەدا مقاوەمە بکات، مریشکیش ئەگەر دەست بۆ جوچکەکانی بەیت پێتدا هەڵدەگژێت، ئەگەر شێریش بیت هەوڵدەدا شتێك هەربکات، دیفاع لەخۆکردن خوای گەورە بەبچوکترین مەخلوقی‌داوە چ جای ئینسانێکی رێزلێگیراو ئینسانێکی بەخەلیفەی خوا دانراو، کەواتە ئەگەر ئینسان پەنا بەرێتە بەر توندوتیژی و چەك بۆ بەرگری لەخۆکردنی دەبێ مەدحی بکرێت، ئێستا ئەمەریکا دەڵێ من بەرگری لەخۆم و لەگیانی هاولاتیانم دەکەم، و

لەبەرانبەردا خەڵك هەمووی ستایشی دەکەن، چونکە ئەوە راستە ئەو دوو بینایە لەنیویۆرك و واشنتۆن روخێنراو خەڵکێکی زۆر کوژرا، لەم رووەوە ئەمریکا حەقی خۆیەتی[٢]، ئەمەریکا ئەمڕۆ گەورەترین دەسەڵاتە لەسەر زەوی.. زلهێزێکە خۆی بەکوێخای دنیا دەزانێ، دەجا ئەوبۆچی بۆی هەیە پەنا بەرێتە بەر توندوتیژیو بۆمبای چەند تەنی، بۆچی بۆ مسوڵمانێك رەوا نییە پەنا بەرێتە بەر ساچمە زەنێك، بڕنەوێك بۆ دیفاع کردن لەمافی رەوای خۆی، چۆن دەبێ بانێك و دووهەوا بێت، کەواتە بەکارهێنانی توندوتیژیو چەك ئەگەر بۆ دیفاع کردن لەشتێکی حەق بێت ئەوا رەوایە ئەگەر بۆ داپڵۆساندنی خەڵك و ماف لێزەوتکردنیان بێت شتێکی خراپە ئەگەر وانەکەین دەبێ بڵێن خەباتی رزگاری خوازی کورد هەر لەسەردەمی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهرییەوە رەحمەتی خوای لێبێت هەتا هەموو ئەو کەڵە پیاوانەی کە ئاڵا بەدەستی خەباتی رزگاری خوازی کوردبوون هەموویان هەڵەیان کردووە چونکە خەڵکیان کوشتووەو دیفاعیان لەخۆیان کردووە شتێکی خەراپیان کردووە، فەلەستینیەکان شتێکی خەراپیان کردووە! هەروەها کەشمیرییەکان، چیچانییەکان هەموو ئەو میللەتانەی دەیانەوێت بەئازادی لەخاکی خۆیاندا بژین، دەبێت بڵێن خراپەکەن، کەبێگومان هیچ ئاقڵێك هیچ خاوەن ویژدانێك ئەوە ناسەلمێنێت. کەواتە کاتێك ئیسلامییەکان بەرگری لە عەقیدەو کیان و بوونی خۆیان دەکەن بۆئەوەی نەچەوسێنرێنەوە بۆئەوەی مافیان نەخورێ شتێکی رەواو بەجێ دەکەن، بەڵام ئەگەر هێز

---

[٢] بۆیە گوتوومە: لەم رووەوە، چونکە ئەگەر رووەکانی دیکەی ئەو مەسەلەیە رەچاوبکرێن ئەمەریکا حەقی نییە:

أ- ئەگەر ئەوەی بەسەری هاتووە کاردانەوەی زوڵم و زۆری بێت کەبێگومان وایە.

ب- مادام بەبێ بەڵگەو ئیسپات ئیدیعا لەسەر خەڵکی دەکات.

ج- مادام شتەکەی کردۆتە بیانوو دەستەچیلەی شەڕێکی گەورە.

بەکاربهێنێت بۆ دەستدرێژی کردنە سەر خەڵك و ئیسلام بەزۆر بەسەر خەڵکدا سەپاندن ئەوە بێگومان شتێکی ناشەرعییە، چونکە خوای گەورە دینی ناردووە دەبێت خەڵك مەمنون بێت ئەوجا خوای بەرزو مەزن بەعەبدی خۆیان لەقەڵەم دەدات و خوای پەروەردگار بەندەکان بانگ دەکات و دەفەرموێت بەندایەتی بۆ من بکەن و شوێن شەریعەتی من بکەون تا بەختەوەر بن، قازانجی ئێوەم دەوێت، بەڵام بەزۆر بەسەریاندا ئیسلام بسەپێنرێت بێگومان لەگەڵ سروشتی دینی خوای (تعالی) ناگونجێت.

**د ) لایەنە سیاسییەکان:**

سەبارەت بەلایەنە سیاسییەکانی کوردستانیش، بەکورتی هەڵوێستمان ئەوەیە: ئێمە لەیەك وڵات و مەملەکەتدا دەژین، بێگومان کۆمەڵێکی زۆر خاڵی هاوبەش لەنێوانماندا هەیە و گەلێك جار لەوتارو خیتابی سیاسیماندا ئەوەمان روونکردۆتەوە؛ کە ئێمە لەگەڵ ئەو برادەرانەی کەلەگەڵمان لەم ساحەو گۆرەپانەی کوردستاندا دەژین، هەر ئایدیۆلۆجییەکیان هەبێت و خاوەن هەر فیکرەیەك بن، ئێمە هەمووومان لە وڵاتێکداین کە کوردستانەو تائێستا لێیان نەسەلماندوین وەك کیان و قەوارەیەکی سیاسی، بۆیە دەبێت بەهەموومان هەوڵ بدەین بازنەیەکی سیاسی بۆ وڵاتەکەمان دیاری بکەین حەقێکی سروشتی خۆمانە، ئەوەش کافرو مسوڵمان تێیدا بەشدارە چونکە ئەگەر وڵات و کیان نەبوو کافر بێت یان موسڵمان هەردەچەوسێتەوە، ئەگەر ئەم وەزعەی ئێستا بەراورد بکەین لەگەڵ سەردەمی بەعس لەرووی سیاسییەوە لەرووی دینی و لەرووی نەتەوەییەوە لەهەر روویەکی ترەوە بەراوردی بکەین جیاوازی نێوانیان ئاسمان و رێسمانە، ئەو کاتە واتە سەردەمی (بەعس) هیچ کەس خاوەنی هیچشتێك نەبوو، ئایا ئێمە دەمان توانی لە شوێنێکی وادا کۆنگرەیەکی رۆژنامەگەری ساز بکەین، دەمانتوانی وتار بدەین، کاك مەسعود و مام جەلال دەیانتوانی وتارێك ئاراستەی

میللەتەکەیان بکەن، ڕێنمایی خەڵکی بکەن، هەمووومان لەو کونە شاخانە گیرمان خواردبوو، کەواتە ئێمە خاڵی هاوبەشمان زۆرن لەگەڵ لایەنە سیاسییەکانی کوردستان، خاوەنی هەر فیکرەو ئایدلۆجیایەك بین. وەك ئیسلامیش بەناشەرعی نازانین لەسەر خاڵە هاوبەشەکان دەستباریان لەگەڵدا بگرین، بابەیەکەوە بەرگری لە کوردستان بکەین، باپێکەوە هەوڵ بدەین مافی سیاسیمان لێ بسەلمێنن و پێمان بدەن ئێمەش خاوەنی کیان و قەوارە بین، ئێمە میللەتێکی (٣-٤) ملیۆنین لانی کەم بالەم پارچە زەوییەی سەربەکوردستانی عێراقە ئێمەش کیان و قەوارەی خۆمان هەبێت ، شتێکی شەرعییە و شتێکی پێویستە لەو پێناوەشدا خەباتێکی زۆرمان کردووە.

لەرووی ئاوەدانییەوە باکوردستان ئاوەدان بێت باخێرو بێرەکانی بۆ خۆمان سوودی لێ وەربگرین، لەرووی بەرەو پێشبردنی فەرهەنگ و ڕۆشنبیری، با میللەتی کورد میللەتێکی خوێندەواربێت ، ڕۆشنبیربێت بالاسای کەرەوە و نەخوێندەوارو دواکەوتوو نەبێت فێڵی لێبکرێت و کڵاوی لەسەر بنرێت، ئەگەر ڕۆژێك لەرۆژان سەرکردەیەکی سیاسیش ، کەسێك، پێی هەڵخلیسکاو هەڵی خەڵەتاند ، با ئەم میللەتە ئەوەندە هۆشیار بێت بیگێڕێتەوە.

ئیمام عومەر خوای لێ رازی بێت شتی دەفەرموو لەسەر میمبەر، ئافرەتێك دەیگوت وا نییە. میللەت دەبێت هۆشیار بێت، هۆشیار کردنی میللەت ڕۆشنبیرکردنی و بەرچاو ڕۆشنکردنەوەی ئەرکێکە هەموومان تێیدا بەشدارین، پاشان گەنج و لاوی ئێمە هەمووی بەرەو هەندەران و وڵاتانی ڕۆژئاوا ڕۆیشتن، میللەتەکەمان خەریکە بەتاڵ دەبێت لەوزەی گەنجەکان، کەئەوە گرفتی هەموولایەکە، باکارێکی وا بکەین کاریان بۆ بدۆزینەوە و دڵخۆشیان بکەین، دڵیان بە وڵاتەکەی خۆیان خۆش بکەین، ئازادی بیرورا ئازادی نووسین یان ئازادی ڕەخنەگرتن و ئازادی دینداریان بۆ دابین بکەین.

ئیتر خاوەنی هەر فیکرەیەك بن، بۆ ئەوەی دڵیان بە وڵاتەکەیان خۆشبێت و سەری خۆیان هەڵنەگرن و بڕۆن. ئەوانە هەمووی خاڵی هاوبەشن دەتوانین تێیاندا هاوکاری بکەین.

**هـ) ئەگەرو گۆڕانکارییەکان:**

سەبارەت بەو مەترسیانەی هەرەشە لە ئەزموونی کوردستان دەکەن، ئەو گۆڕانکارییانەی ئەگەر ی ئەوەیان هەیە لە ئایندەدا روویدەن لە کوردستان و عێراق دا، ئێمە چەند پرەنسیپ و مەبدەئێکی نەگۆڕمان لەو بارەیەوە هەیە:

**یەکەم:** ئێمە لەگەڵ ئەوەداین کە ئەوەندەی بەدەستمان هێناوە لەو ماف و لەو کیانە ، دەبێت هەوڵ بدەین بیپارێزین و لەدەستمان نەچێ و هەوڵبدەین گەشەی پێ بدەین فراوانی بکەین.

**دووەم:** ئێمە پێمان وایە کە کوردستان نەهی پارتی دیموکراتی کوردستانە بەتەنیاو نەهی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانەو نەهی هیچ حزبێکی ترە نەهی هیچ لایەنێکی ئیسلامییە بەڵکو کوردستان هی ئەو میللەتە مسوڵمانەیە، هی ئەو میللەتەیە کەلە سەر ئەم کوردستانە دەژی، تەنانەت ئەوەش کە ناموسڵمانە بەشی بەو کوردستانەوە هەیە، کەواتە هەموومان خاوەن بەش و پشکین لەکوردستان دا پاراستن و بەرگری لێکردنیشی ئەرکی سەرشانی هەموو لایەکمانە، مرۆڤیش تا لەشتێکدا زیاتر مافی خۆی ببینێت هاندەری زیاتر دەبێت بۆ بەرگری لێکردنی و پاراستنی.

**سێیەم:** سەبارەت بەلێدانی رژێم و لێنەدرانی ئێمە پێمان وایە ئەمەریکا لەبەر چاوی کاڵی کورد لەصەددام و رژێمی بەعس نادات و صەددام لانابات، ئەگەر بەرژەوەندی ئەمەریکا لەوەدا بێت رژێم لاببات لای دەبات و ئەگەر بەرژەوەندی لەهێشتنەوەشی دابێت دەیهێڵێتەوە، وەك لەرابردووشدا وابوو، چونکە کاتی خۆی گەورەترین زوڵممان لێکرا، کیمیا باران کراین و بەناو ئەنفال کراین و جینۆساید کراین، کەسێك لەسەر ئێمە هەڵی نەدایە، ئەو

دەزگا سیخوڕیو مانگە دەستکردانەش کەئێستا سیخوڕی لەسەر هەموو شتێك دەکەن، ئەوکاتەش هەر هەبوون، دەیانزانی کورد چی بەسەردێت بەڵام دیارە ئەوکاتە بەرژەوەندییان لەوەدا نەبوو لەسەرمان هەڵدەنێ، بەڵام کاتێك کە دەوڵەتی کوێت داگیرکرا، بەرژەوەندییان لەوەدا بوو لەسەری هەڵدەنێو بیکەن بەبیانوو، من جارێك لەگەڵ بەرپرسێکی ئەمەریکی کەئافرەتێك بوو دانیشتم، پێش دووساڵ لەمەوبەر، سەردانی دەڤەری ئەولای کردبوو لێم پرسی: ئێوە بەتەمای چین سەبارەت بەگۆڕینی ڕژێم؟ ئەو گوتی: من یەك ڕاستیتان پێدەڵێم، ئێوە ئەوە بزانن ئێمە چی بەرژەوەندی خۆمان بێت ئەوە دەکەین ئێوەش ئاگاتان لەبەرژەوەندی خۆتان بێت.

منیش گوتم: خۆزگە ئەوەی کە تۆ بۆ خۆت ئاوا دەیڵێیت پڕ بەزاری، ئێمەش وەك سیاسییەکانی کورد هەموومان قەناعەتمان وابوایە، کەئەمەریکا عەوداڵی جێبەجێکردنی بەرژەوەندییەکانی خۆیەتی، کورد دەبێت خۆی ئاگای لەخۆی بێ بەو توانایەی کە هەیەتیو پێشمان وایە ئێمە ئەگەر یەك بینو بەیەکەوە بین، ئەگەر دەستمان لەناو دەستی یەکتردا بێت بێگومان دەتوانین گەلێك مەترسی لەخۆمان بڕەوێنینەوەو گەلێك ئامانج بهێنینەدیو ئەگەر ڕژێمی بەعسیش خودا کردیو ڕوخاو لاچوو ئەوە بێگومان هیچ کوردێکی بەشەرەف چ مسوڵمان بێت چ کافر فرمێسکی بۆ ناڕژێت چونکە ئێمە لەو ڕژێمە بێجگە لە ماڵ کاولکردنو نیشتمان کاولکردنو خەڵك شوێن بزرکردنو بەندکردنو سێدارەو ئەشکەنجە هیچی دیکەمان بەبیرنایەت، ئەگەر لێیان دا ئاوەو ئاو بچێت، بەڵام بێگومان ئەوە دەزانین کاتێك لێی دەدەنو لای دەبەن کەبەرژەوەندی خۆیانی تێدا بێتو هیچ پەیوەندی نییە بە بەرژەوەندی کوردەوە بەڵام دەبێت کورد بۆخۆی ئاگای لێی بێت ، سود ببینێت لەو بایەی کە هەڵدەکات، ئەگەر جارجار لەگەڵ بەرژەوەندی ئەو تێکی کردەوە ئەویش کەو و شەنی خۆی بکاتو سودێکی لێوەربگرێت. دووبارە من خۆشحاڵی

خۆم دەردەبڕم بەئامادەبوونی ئەو بەڕێزانە . ئەمجا دەرگای پرسیارو وەڵام ئاوەڵا دەکەین، بەڵام (إن شاء الله) برایانی ڕۆژنامەنووسو ئیعلامی بەئەمانەتەوە ئەوەی کە لێرە دەیبیستنو دەیبینن بڵاوی بکەنەوەو با هەمووشمان بوێر بین، حەق بێژ بین بێگومان دڵسۆزیمان بۆ ئەو دوو ئیدارەیەی کە هەیە بەتایبەتی ئێوە وەك ئیعلامیی، چی کەمو کوڕیو ناتەواوی هەیە بۆشاییەك دەبینین ڕاشکاوانەو بوێرانە پێیان بڵێن، ئەوە دڵسۆزییە، نەك چاو لەڕاستییەکان بنوقێنینو شتەکان ژێر لێو بخەین، بەڕاستی گەلێك جار هەست پێدەکرێت خەڵك ئەو تۆمەتە دەداتە پاڵ ئیعلامییەکانو دەڵێت: کاکە خۆ ئەوانە خاوەنی بیروڕای خۆیان نینو ئەوانە چیان پێبگوترێت ئەوانە وا دەڵێن، ئێمە ناڵێین وایەو هەموو کەسێك بەوشێوەیەیە بەڵام بەڕاستی خەڵکی ئیعلامی خەڵکی ئەهلی فیکر و ئەهلی قەڵەم جێی خۆیەتی کە لەم بارودۆخە ناهەموارەی کوردستاندا دڵسۆزی خۆیان بەوە پیشان بدەن کە چی چاکەو چی حەقە بۆ خەڵكو بۆ میللەتەکەو بۆ ئەزموونەکە ئەوە بخەنەڕوو ، نەك چی حوکمڕانو دەسەڵاتدارێك پێی خۆشە.

وصلى الله على محمد وعلى اله وصحبه اجمعين والحمدلله رب العالمين.

## پرسیارەکان:

رزگار ئەژی گۆران (سەرنووسەری پەیامی ئاشتی):

پرسیاری یەکەم: پێشەکی سوپاسی بەڕێزتان و برادەرانی مەڵبەندی ڕێکخستنی هەولێری کۆمەڵی ئیسلامیی دەکەین کە ئەو دەرفەتەتان بۆ ڕەخساندین بۆئەوەی لەنزیکەوە جەنابت ببینین و گوێمان لەو فەرمایشتانەی جەنابت بێت، ئەڵبەتە من سەرم سوڕنەماوە لەوەی کە ئەو قسە جوانانە بۆ ئێمە دەکەن، بەڵام بەڕاستی ئەوەی لەیادەوەری مندا بێت لەوکاتەدا چاوپێکەوتنێکی بەڕێزتان بوو لەکوردستانی نوێ ساڵی ١٩٩٢ کاتی خۆیشی من هەر لەوانەیە موعجیبیش بووبم بەو مەقولەیەی بەڕێزتان کە دەفەرموون (من بەپێی بنەماکانی دیموکراسییەت دژی دیمکراسییەتم)، ئەم قسانەی ئێستای بەڕێزتان لەگەڵ قسەکانی ئەو ڕۆژانەت (١٨٠) پلە جیاوازییان هەیە، واتە جیاوازی زۆرە، ئایا ئەوە کاریگەری قۆناغەکەیە بەسەرتانەوە یان ئەو شێوازەی لەخەبات گرتووتانە بەر ئەوەی پێسەلماندن کە ناچار بن ملبدەن بۆ دیموکراسییەت یان ئەوە حەقیقەتەکەیە دەبێت دیموکراسی بین.

پرسیاری دووەم: ئەگەر ئیجازە بدەن من ئیتر پرسیار ناکەم، ئەوەی من زانیبێتم بەرژەوەندی ئیسلام بەرژەوەندییەکی گشت گیرە لەیەك سەرچاوەوەو لەیەك ڕوانگەوە سەیر دەکرێت کە بەرژەوەندی ئوممەتی موحەممەدەو بەرژەوەندی کۆمەڵگەی ئیسلامە، باشە ئەو جیاوازییە لەنێوان ڕەوتە ئیسلامییە سیاسیەکاندا لەکوردستان و جیهانی ئیسلامیشدا بۆ خۆی بەرژەوەندییەکان پەرت ناکات، ئەگەر جیاوازی هەیە لەفیکر، لەئیجتیهاد، لەئەحکام لەکۆمەڵێك مەسائیلی تری ئایینی و بۆچوونی تایبەتی،

جیاوازییەکان چین لەنێوان ئێوەو رەوتە ئیسلامییەکانی تردا و ئەگەر ئەو جیاوازییانە هەن بۆچی گوێمان لێنەبوو لەراگەیاندنی تەیاری ئیسلامییەکانەوە سیمینارێك رووبەڕووبوونەوەیەك و گفتوگۆیەك و بڵێن ئەمە جیاوازییەکانی نێوانمانە بۆچی جیاوازییەکان میللەت نایزانێت و خەڵکی نایزانێت، جیاوازی نێوان یەکگرتووی ئیسلامی، کۆمەڵی ئیسلامی، بزووتنەوەی ئیسلامیی جیاوازییەکان لەسەر چین. ئەگەر جیاواز نین بۆچی یەك نین. ئەگەر ئەو دوو پرسیارەم وەڵام بدەیتەوە زۆر سوپاست دەکەم زۆر بەخێربێیت بۆ هەولێر.

**مامۆستا عەلی باپیر:**

**یەکەم:** ئەوەی کە لە (٩٢)دا گوتومانە بەڕێزت واتزانیوە کەدژایەتی هەیە لەگەڵ ئەوەی کەئێستا دەیڵێین، قسەکەی ساڵی (٩٢) لەکوردستانی نوێ لەبیرمە گوتم (بەپێی دیموکراسییەت بۆمان هەیە بڕوامان بەدیموکراسییەت نەبێ) چونکە یەکێك لەبنەماکانی دیموکراسییەت ئازادی بیروڕایە، بەڵام پێکهاتەی دیموکراسییەت تەنیا ئازادی بیروڕا نییە، دیموکراسییەت لە چەند بنەماو چەند چەمکێك پێکدێت، یەکێك لەبنەماکانی دیموکراسییەت بریتییە لەڕێزگرتن لەئیرادەی میللەت ئێمە لەگەڵیداین یەکێکی تر لەبنەماکانی دیموکراسییەت بریتییە لەئاڵوگۆڕکردنی دەسەڵات دەستاو دەست پێکردنی دەسەڵات ئەوەش ئێمە لەگەڵی داین، بەڵام لەچەند شتێکیش دا لەگەڵ دیموکراسییەت تێك دەگیرێین. بەتایبەتی لەوەدا لەگەڵ دیموکراسییەت تێکدەگیرێین؛ دەڵێین شەریعەتی ئیسلام کۆمەڵێك شتی دیاریکردووە کە نەگۆڕو چەسپاون: زینا حەرامە، قەتڵ حەرامە، شەراب حەرامە، پاشان خوای گەورە پەرستراوی خەڵکە و یاسای بۆ بەندەکانی دیاریکردووە، بەڵام لەپەرلەماندا لەرژێمی دیموکراسیدا هەموو شتێك بەدەنگدانە بۆ نموونە ئایا پیاو لەپیاو مارە بکەین یان نا ئەگەر دەنگەکان

زیاتربوون دەڵێن؛ بەڵێ. ئەمەش ئەوپەڕی نزمییە، ئەوە بۆچی لەوێ وایە چونکە سیستەمی حوکم نەخراوەتە چوارچێوەیەکەوە، خوای پەروەردگار چوارچێوەیەکی داناوە لەو چوارچێوەیەدا مرۆڤ ئازادەو لەو چوارچێوەیەدا خەڵك بەرپرسانی خۆی هەڵدەبژێرێت و لەو چوارچێوەیەدا مومارەسەی ئاڵوگۆڕی دەسەڵات دەکرێت، ئەو چوارچێوەیەش خەڵك وادەزانێت ئیسلام هەموو وردودرشتی لەوبارەوە دیاریکردووە کە دەبێت گەورەی وڵات ناوی خەلیفە بێت دەبێت وا بێت و وابێت. . بەڵام وا نییەو بۆ زانیاریتان لەئیسلامدا بەوردیی شێوەی دەسەڵاتی سیاسی دیارینەکراوە، بەڵکو چوارچێوەیەکی فراوانی بۆ دیاریکراوە لەسەر بنەمای پرسوڕا بەیەکترکردن و ناوەندێتی (الشوری والمرکزیة) ئیدی جگە لەچوارچێوەیەکی گشتی و چەند بنەمایەکی سەرەکی گەلێك شت بەجێهێڵراوە بۆ تاقیکردنەوەو ئەزموونی مرۆڤ.

دووەم؛ لەو رووەوە کەفەرمووت ئیسلامییەکان ئایا لێك جیان ئەگەر لێك جیان بۆ دیار نییە ئەگەر لێك جیا نین بۆیەك نین، پرسیارەکەت جوانە. بێگومان ئیسلام یەك ئیسلامە بەڵام بەشێکی زۆری دەقەکانی ئیسلام راڤەی جیاجیا هەڵدەگرێت ئەگەر تەفسیری جیاجیاشی هەڵنەگرتایە فریای بەرەو پێشچوونەکانی ژیان و گوزەران و پێشکەوتن نەدەکەوت، لەسەردەمی پێغەمبەر ﷺ کۆمەڵگا سادە بووە لەڕووی سیاسییەوە، لە رووی ئیداری، کۆمەڵایەتی و ئابووری، بەشێوەیەك ئیدارە کراوە کە لەگەڵ ئاستی سادەیی ئەوکاتەدا بگونجێت کاتێك ئیمامی عومەر خوالێی رازی بێت دێتە سەر کارو زۆرێك لەوڵاتانی ئەو رۆژگارە بەهەڵومەرج و واقیعی جیا جیاو جۆراوجۆرەوە دێنە ژێر سایەی حوکمی ئیسلامیی، ئیمام عومەر خوالێی ڕازی بێت کۆمەڵێك شت دادەهێنێت کەلەڕۆم و فارسەکانەوە وەریان دەگرێت، پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی (عومەر خەلیفەیەکی راشیدە) بۆ

وێنە: تەدوینی دەواوین دەکات، بەریدو پۆستە دادەنێت، سجن دروست دەکات، کۆمەڵێك شتی ئیداری لەدەوڵەتی فارس و رۆم وەردەگرێت و دایدەهێنێت، چونکە ئیسلام لەرووی ئیدارییەوە شتێکی دیاریکراوی دانەناوە بەڵام لەچوارچێوەی پێودانگە شەرعییەکاندا بنەما سەرەکییەکانی دەسەڵاتی دیاریکردووە، بەڵێ دەگونجێت ئیسلامییەکان و ئەهلی ئیسلام جیاوازی لەبیروبۆچوون و بیروڕایاندا هەبێت وەك چۆن ئەبوبەکرو عومەر (خوا لێیان رازی بێت) لەگەڵێك شت بۆچوونیان لێك جیابووە، بەڵام هەر پێکەوەش برابوون ئینجا ئەوەش کەتاوەکو ئێستا رووبەڕووبوونەوەیەك و مێزگردێك لەلایەن ئیسلامییەکانەوە لەوبارەیەوە نەکراوە رەنگە ئەوە هەلومەرج هەڵینەگرتبێت یان ئیسلامییەکان ئەو پێگەیشتن و کامڵییەیان نەبووبێت، خۆناڵێین کامڵین، ئێمە دەڵێین ئیسلام کامڵە بەڵام خۆمان زۆرجار کرچ و کاڵین و ناتەواویمان هەیە، یان هەلومەرجی سیاسی رێگەی نەداوەو بوار نەڕەخساوە، یان وەکو وتم بۆ خۆمان کرچ و کاڵین. بۆچیش یەك نین؟ مەرج نییە موسڵمانان کاتێك برا بن و کاتێك یەك بن کە هەموو شتێکیان فۆتۆکۆپی یەکتر بێت، دەگونجێت لەسەر یەك بابەت سێ چواربۆچوون هەبێت، ئەوەش دەلالەت لەسەر بەپێزیی ئیسلام دەکات کە دەقەکانی قورئان و سوننەت بواری تەئویل و بۆچوونی جیاجیایان تێدا هەیەو هەربۆیەش دەگونجێت گۆڕانکارییەکان هەموویان ئەحکامیان بۆ هەڵبهێنجرێت لەو دەقە دیاریکراوانەی قورئان و سوننەت، وە ئێمە یەکبوون و برایەتی ئیسلامییەکان لەوەدا نابینین کەحەتمەن لەیەك حزبدا بن و حەتمەن لەهەموو شتێکدا یەك بۆچوونیان هەبێت، ئەبوبەکرو عومەر خوالێیان رازی بێت. دوو پیاوی گەورە، دوو وەزیری پێغەمبەر ﷺ ئەویان بۆچوونێکی هەبووە ئەویان بۆچوونێکی دیکەی هەبووە. عەلی و عوسمان خوالێیان رازی بێت بەهەمان شێوە موجتەهیدەکان، شافعی و ئەبوحەنیفەو مالیك و ئەحمەد

ڕەحمەتی خوا لەسەر هەموو لایەکیان بێت بۆچوونی جیاجیایان هەبووە .
بەڵام هەمووی لەچوارچێوەی فراوانی شەریعەتدا.

**بەختیار سەعید تەڵەفزیۆنی هەرێم:**

هەروەها وتەکەی هاوکارمان دووبارە دەکەمەوە بەخێرهاتنتان دەکەین بۆ پایتەختی هەرێمی کوردستان هەولێری قەڵاو منارە، جەنابی مامۆستا عەلی باپیر ئەمیری کۆمەڵی ئیسلامیی! هەڵبەتە بۆئەوەی کە هەموو هاوکارانمان بتوانن پرسیارەکانیان بکەن، وا چاکترە وەڵامەکانی جەنابتان تارادەیەك کورت بن، هەموو لایەك سودمەندبن و پرسیارەکانیشم لەسێ چوار پرسیاردا خۆی دەبینێتەوە.

**پرسیاری یەکەم:** پرسیارەکەی من بەوە دەستپێدەکات: هاتنی بەڕێزتان دوای هاتنەکەی بەڕێز جەنابی مامۆستا مەلا عەلی عەبدولعەزیز ڕابەری گشتی بزووتنەوەی ئیسلامیی بوو، دەکرێت خوێندنەوەیەکمان بۆئەوە هەبێت، هاتنتان لەسەر بانگهێشتی جەنابی سەرۆك بارزانی بوو؟ یاخود چ تێڕوانینێکتان هەیە بۆئەوەی هەردووکتان لەماوەی هەفتەیەکدا گەیشتنە ئێرە دیدارەکانتان چیبوو، خاڵێکی هاوبەش چی بوو بۆئەوەی یەکتر ببینن؟

**پرسیاری دووەم:** جەنابتان ئاماژەتان بەوەدا کەقورئانی پیرۆزو ئیسلام هەمیشە لەگەڵ تیرۆردا نەبووەو ڕەتی کردۆتەوە ئێمەش صەد دەر صەد لەگەڵ ئەوەداین بەڵام ئەو کەس و گروپ و لایەنانەی کەهەمیشە ئەو کارانەیان کردووە هەموو سەر بەئیسلامییەکان بوون ئێمە دەمانەوێت لەسەر شەهیدکردن و تیرۆرکردنی شەهید فرانسۆ هەریری تاکو ئێستا وەك کۆمەڵی ئیسلامیی هەڵوێستێکی ڕوونتان لەو ڕووەوە نەبووە بەمەرجێك بکوژان و ئەو کەسانەی دەستیان لەو کردەوە نامرۆڤانە هەبوو لەدەڤەری ژێر دەسەڵاتی ئێوەدان.

**پرسیاری سێیەم:** جەنابتان ئاماژەتان بەوەدا کەگروپە ئیسلامییەکان خەباتێکی بێوچانیان هەیە بۆئەوەی بتوانن میللەتی کورد لەمەزلومییەت دەربکەن، و هەنگاوەکانیان زۆر بەرەو پێش چووە، بۆچی هەتا ئێستا نەتان توانیوە قەناعەت بەگروپە ئیسلامییەکان ئەوانەی جیهادین یان هەر بەرنامەیەکی‌تر پیادە دەکەن، نەتان توانیوە لەکۆنگرەیەکی ئیسلامی لەولاتان، ئەو کۆنگرە ئیسلامییانەی کەولاتانی عەرەبی ئیسلامی جیهانی پێی هەڵدەستن تائێستا نەتان توانیوە وشەیەکی کورد بەکاربهێنن‌و یاخود بەشدارییەکی خۆتان هەبێت؟

**پرسیاری چوارەم:** دوایین دانیشتنتان بەهاوکاری کۆماری ئیسلامی بۆ چارەسەرکردنی کێشەو گیروگرفتەکان لەگەڵ برایانی بزووتنەوەی ئیسلامیی‌و گروپی تیرۆرستی (جند الاسلام) لەرێککەوتننامەکەدا خاڵێك هەیە کە دەبێت کۆمەڵی ئیسلامیی ئیدانەی ئەو گروپە بکات تا چ رادەیەك توانیوتانە ئەو بەیاننامەیە جێبەجێ بکەن کەتائێستا ئێمە ئەو بەیاننامەیەمان نەدیوە کە کۆمەڵی ئیسلامیی دژ بەگروپی (جند الاسلام) کەئێستە ناوی خۆیان ناوە (انصار الاسلام) دەربکەن. سوپاستان دەکەین.

**مامۆستا عەلی باپیر:**

مەسەلەی کورت‌و درێژی وەڵامەکان، هەندێك شت من نامەوێ هەڵیکروزێنم و یەکەمجارە کۆنگرەیەکی رۆژنامەوانی لێرە ساز دەکەین بەڵام جاری وا هەیە سروشتی پرسیارەکانیش کورت‌و درێژی وەڵامەکان دیاریدەکەن.

**یەکەم:** سەبارەت بەهاتنی ئێمە کەپاش تەشریف هێنانی مامۆستا مەلا عەلی بوو ئایا چۆن بوو ئایا لەسەر بانگهێشتی جەنابی کاك مەسعود بوو، ئێمە لەرەمەزاندا داوامان کردبوو لەسەرکردایەتی پارتی‌و لەجەنابی کاك مەسعود کەسەردانیان بکەین بەمەبەستی گەرمکردنەوەی پەیوەندی ساردی

نێوانمانو بەمەبەستی توندوتۆڵکردنی پەیوەندی دۆستایەتی شلبووەوەی نێوانمان، ئێمە لەرەمەزاندا داوامان کردبوو دیارە برادەران دەست گیراوبوونو سەرقاڵ بوون بەکۆمەڵێك ئیشو کارەوە ئەوەبوو کە لەم ڕۆژانەدا کاتی دیدارەکەیان دیاریکردبوو، واتە لەسەر داوای خۆمان بوو بۆئەو مەبەستەش بوو کە عەرزم کردن، جەنابی مامۆستا مەلا عەلیش تەشریفی هاتووە دیارە ئەویش دەگونجێت پرسیار لەخۆی بکرێت کەئەویش چۆن هاتووە ئەویش دیارە مامۆستا ئێستا ڕابەری بزووتنەوەی ئیسلامییە، ئێمە لەگەڵ جەنابی مامۆستا مەلا عەلیو لەگەڵ هەر موسڵمانێکی تر قەراری برایەتیمان هەیەو بەتایبەتی لەرێککەوتنامەی تاران لەیەکتر تێگەیشتنمان کردووە بەیەکەوەو هەندێك شتو گریو گۆڵێك لەبەیندا هەبووە، بڕیار دراوە کە نەهێڵرێت و هەندێکیشی چارەسەرکراوە.

دووەم: سەبارەت بەتیرۆر کەئیسلام ڕەفزی دەکاتەوە، کوشتنی کاك فرانسۆ حەریری، کەئێمە هەڵوێستمان نەبووە، ئێمە ناچینە نێو هەندێك کێشەوە کەپەیوەندی پێمانەوە نەبێت، کاتی خۆی کۆمەڵێك لەئێمە جیابوونەوە بەناوی تەوحید چوونە چیاکانی قەندیل لەوێوە مەفرەزەیان کرد، هاتنە ناوچەکانی پارتی، پارتی (١٠-١٥) نەفەری لێکوشتن، کەپێمان وابوو دەبووایە کە دەنگ بدرێنو بڵێن ناوچەکە چۆڵکەن نەك یەکسەر بکوژرێن، بەڵام ئێمە ئەوکاتە بەچاکمان نەزانی بەیان دەربکەینو گوتمان ئێستا ئێمە بەیاننامەیەك بنووسین یان گلەییەك بکەین یان شتێك بڵێین ڕەنگە وا لێك بدرێتەوە کەئەوانە سەر بەئێمەن لەکاتێکدا کەسەر بەئێمە نەبوون، قەناعەتیان بەئێمە نەبوەو ئێمەش قەناعەتمان بەو بیروبۆچوونانەی ئەوان نەبووە، لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە هەر بەموسڵمانیان دەزانین بەڵام بیروبۆچوونو شێوەی کارکردنیان لای ئێمە هەڵە بووە. دوایی کەلێرە کاك فرانسۆ کوژرا ئێمە بەڕاستی لێمان دیارنەبوو کێیە لەبەرئەوە هەڵوێست

لەشتێکی نادیار وەرناگیرێت ئێستاش لەگەڵدا بێت پێم وایە ئەوان هەر ئەیان کردۆتە ماڵ لەسەر خۆیان ئەمجا کاتی خۆی کەلێیان کوژرا دەنگمان نەکرد، دوایش کەخەڵکیان کوشت بەپێویستمان نەزانی دەنگ بکەین چونکە ئەوان دەیان گوت تۆڵەی خۆمانمان کردۆتەوە.

سێیەم: سەبارەت بەوە کەلەلای ئێمەن، نەخێر لەلای ئێمە نین ئێمە وەك کۆمەڵی ئیسلامیی خۆمان بەدەوڵەت و کیان و قەوارەیەك نازانین هەرکەسێك لەگەڵ ئێمە نەیار بوو یان لەگەڵ سیاسەتی ئێمە یەکی نەگرتەوە بڵێین: لێرە لاچۆو برۆ، ئەوان بێگومان ماڵ و خێزانیان لەوێیە بەڵام سنووری ژێر دەستی ئێمە جیاکراوەتەوە لەهی ئەوان کەئەوان ئێستا بەناوی (انصار الاسلام)ەوە کاردەکەن کە بێگومان ئێمە تێبینیمان هەیە لەسەر گەلێك لەبیروبۆچوون و مومارەسەی هەڵەیان کەپێمان وایە هەم بەپێوانەی شەرعی هەڵەیە هەم بەپێوانەی بەرژەوەندی ئێستای میللەتەکەمان کەئەویش هەر شتێکی شەرعییە چونکە شەرع بۆیە هاتووە بەرژەوەندی خەڵك و میللەت دابین بکات و پێمان وایە کارو رەفتاریان زیاتر بەرهەمی جۆرێك لەکەوتنە ژێر کاریگەری فیکری ئەملاو لایە، وەجۆرێك لەلاساکردنەوەی ئەزموونی خەڵکی تر، بەڵێ ئێمە تێبینیمان لەسەریان هەیە ئەوانیش بۆ خۆیان کۆمەڵێکن چ پەیوەندییەکیان بەئێمەوە نییە، هەوڵمان لەگەڵ دان بێنە نێو کۆمەڵی ئیسلامیی و دەستبەرداری ئەو جۆرە بیروبۆچوون و مومارەسە هەڵانەی خۆیان بن، بەقسەی ئێمەیان نەکرد، دوایی کەخۆیان لەمەیدانی واقیعدا بۆیان دەرکەوت کەبیروبۆچوونەکانیان هەڵەیە بەرپرسی یەکەمی خۆشیان گۆڕی و ناوی حزبەکەشیان گۆڕی ئێستاش لەگەڵ برادەرانی یەکێتی دانیشتن و شتیشیان کردووە نازانین دەگەنە چی گرنگ ئەوەیە کەکاتی خۆی ئێمە پێمان گوتن دوایی هاتنەوە سەر قسەکانی ئێمە بەڵام دوای ئەوەی کە ئەو رووداوانە روویاندا کە پێم وایە خۆشیان زەرەریان لێکردو زەرەری

بۆناوچەکەش بوو. لەبارەی بەشداریکردنمان لەکۆنگرە ئیسلامییەکانی دەرەوە، کاک بەختیار خۆتان ئاگادارن وەك چۆن برادەرانی پارتی و یەکێتیی کەئێستا سەرو ئیدارەیان هەیە، کیان و قەوارەیەکیان هەیە کەخۆیان بەحکومەت و بەشتێك دەزانن، بەلام لەنەتەوە یەکگرتووەکان لەشوێنە رەسمیەکان و لەو شوێنانە بواریان پێنادرێت مەگەر لەسەر ئاستی حزبی هەلسوکەوتیان لەگەلدا بکرێت ئێمەش بێگومان کەکیان و قەوارەیەکمان نییە لەو شوێنە رەسمیانە بوارمان پێنادەن بەلام شتی تری نارەسمی جاری وابووە بەشداریمان کردووە لەو کۆنگرانەی کەوەك کۆمەلە ئیسلامییەکان یان کەسایەتییە ئیسلامییەکان یان لایەن و رێکخراوە ئیسلامییەکان دەیبەستن هەولمان داوە بەشداری بکەین زۆرجاریش کەبەشداریمان بۆ نەکراوە لەبەر هەلومەرجی ئێستا بووە یان مەسەلەی سەفەر بۆ نەکران و لەوبابەتە بووە.
چوارەم: ئەو رێککەوتننامەیەی کەئێمە لەتاران کردوومانە لەنێوان ئێمەو کۆماری ئیسلامیی بووە، کۆماری ئیسلامیی بەرەسمی دانی بەوەدا ناوە کە کۆمەلی ئیسلامیی هەیەو کاری خۆی دەکات کەپێشتر رەنگە تێبینیان لەسەر ئێمە بووبێ و گلەییو شتیان بووبێ، لەسەرێکی تریشەوە ئێمە رێککەوتننامەیەکمان لەگەل برادەرانی یەکێتیی کردووە، ئێمە کاتی خۆشی ئەو پرسیارەمان لێکرا سەبارەت بە (جند الاسلام) گوتمان هیچ شتێکمان ئیمزا نەکردووە دژی هیچ گروپ و کۆمەلێکی ئیسلامیی، هەروەها لەرێککەوتننامەکەدا برگەیەك هەیە کەبەیاننامەیەك دەربکرێت. بەلام ئێمە لەگەل برادەرانی یەکێتیی لەسەر نیوەرۆکی بەیاننامەکە رێك نەکەوتین بۆیە ئەو بەندەمان هەلوەشاندەوەو ئەو بەیاننامەیە دەرنەکرا، ئێمە هەرچەندە تێبینیمان هەبێت لەسەر لایەنێکی ئیسلامیی بەلام بەچاکی نازانین کارێك بکەین بچینە تای تەرازووی خەلکێکی ترەوە، ئێمە لەگەل یەکێتیی نیشتمانیش رێککەوتننامەمان هەیە بەلام نەك رێککەوتن لەسەر حسابی

خەڵکی، بەڵکو ڕێککەوتن لەپێناوی ئەوەی بەرژەوەندی هەردوولا پارێزراو بێت نەک زەرەر لەخەڵکی تر بدەین، ڕەنگە برادەرانی یەکێتیی تەکلیف و داواشیان لەئێمە بووبێت کە ئەوەمان بۆ بکەن و ئاشاوا بکەین و ئاوا بکەین ئێمە ئەوەی بەشەرعیی‌مان نەزانیوەو عەقڵمان نەیبڕیوە نەمانکردوە.

**کاک شوکر ڕۆژنامەی دەنگی میللەت:**

مامۆستا تۆ لەسەرەتای باسەکەت و لەناوەڕاستی باسەکەتدا وتت ئێمە میللەتێکین لەم پارچە ئازادەی کوردستان پێویستە هەموومان دەستبار لەگەڵ یەکتر بگرین ئایا ئەوەیە نەهجی لەمەودوای کارکردنی کۆمەڵی ئیسلامییە یاخود پێشتر ئەو حەقیقەتە لەلای بزووتنەوەی ئیسلامیش هەبووە، ئەگەر وایە نەدەکرا ناکۆکییەکانی نێوان خۆتان دوابخەن بۆ سەرکەوتنی ئەم ئەزموونە.

**مامۆستا عەلی باپیر:**

ئێمە ئەوەی کەئێستا دەیڵێین وەک کۆمەڵی ئیسلامیی کاتی خۆشی وەک تەوژم و ڕەوتێک لەنێو بزووتنەوەی ئیسلامیی پێشووترو لەناو بزووتنەوەی یەکبوونی ئیسلامیدا ئەو بیروبۆچوونانەمان بەوشێوەیە هەر هەبووەو یەکێک لەو هۆیانەی کەناچاری کردین کەئێمە لەژێر ئەو ناونیشانی بزووتنەوەی یەکبوونی ئیسلامیی و لەژێر سێبەری ڕابەرایەتی جەنابی مامۆستا مەلا عەلی دەربچین ئەوە بوو کە نەمان دەتوانی ئەو بیرو ڕاو قەناعەتە ئیسلامییانەی کەپێمان ڕاست و پێمان ڕەواو پێمان گونجاو و شیاوبوو کە لەواقعی کوردستاندا بەرجەستەو پیادە بکرێن بۆمان نەدەکرا کەپیادەیان بکەین یەکێک لەهۆیەکان ئەمە بوو کەجەنابت دەفەرمووی نەدەکرا دوای بخەن، ئێمە زۆر لەبیروڕاو قەناعەتەکانی خۆمان دواخست هەتا وای لێهات تەماشامان کرد خەریکە لەسەر بوونی ئەو جموجوڵە ئیسلامییە قەرزدار دەبینەوە

تەماشامان کرد خەڵکێکمان لەپێناوی بەرژەوەندی تایبەتی خۆیدا پەیوەندی بەرقەرار دەکات لەگەڵ ئەم لایەن و ئەو لایەن دا کەتەنیا بەرژەوەندی تایبەتی خۆی دێنێتە دی، بەڵام ئەوە لەسەر هەموو حزبەکە دەکەوێت و، تەماشامان دەکرد لەگەڵ ئەملاولاو فراوانتر لەلایەنە سیاسییەکان هەندێك جموجووڵ و هەندێك پەیوەندی و شتی ژێر بەژێر هەیە کە زیاتر ئێمەی پێناشیرین دەبێن و خەڵکیش ئینتیباعێکی خراپمان لێوەردەگرێت، زۆریش هەوڵمان دا ئەو شتانە راست بکەینەوە، ئەوانەی کە لەنێو بزووتنەوەی یەکبووندا بوون هەموو زۆر چاك دەزانن لەرێگەی شووراوە لەرێگەی کۆنگرەوە زۆرمان هەوڵداو پاشانیش تەرەفی بەرانبەر بەئەنجامەکانی کۆنگرەوە پابەند نەبوو بۆیە ئێمە ناچار خۆمانمان ئیعلانکرد، ئەگینا ئەو بیروبۆچوونانەی کەجەنابت فەرمووت کەئایا تازە بۆتان دروست بووە؟ نەخێر ئێمە کاتی خۆیشی هەمان بووە.

بەبەڵگەی ئەوەی کە دەتوانن کتێبی (سۆزی نەتەوایەتی لەروانگەی ئیسلامەوە) بخوێننەوەو کتێبەکانی ترمان کەهەن تەماشایان بکەن ئێمە هەمیشە باوەڕمان وا بووە کە ئێمە وەك میللەتێك، بەیەکەوە نەبێت ناتوانین ئامانجەکانمان بهێنینەدی، ئێمە دەڵێین پێغەمبەری خوا ﷺ دەوڵەتی ئیسلامیی راگەیاندووەو دایمەزراندووە لەسەر بنەمای قەناعەت پێهێنانی خەڵك و بانگەوازو تەفاعولکردن لەگەڵ ئیسلامدا نەك لەسەر بنەمای خەڵك بتۆقێنین و بیانترسێنین بۆیە ئەو دەوڵەتە دەوڵەتێکی ئیسلامییە کە خەڵك لەباوەشی گرتووەو، هەر کیان و دەوڵەتێك بنکەی جەماوەری نەبێت و خەڵك لەباوەشی نەگرێت و قەناعەتی پێنەبێت بەرگەی تەحەددیات ناگرێت.

**کاك عەبدولخالق موحەممەد (...)**

**پرسیاری یەکەم: ئایا پشتگیریی ئێوە لەم ئەزموونەی کوردستان لەچیدا خۆی دەنوێنێ؟!**

**پرســـیاری دووەم:** ئایــا لــەنێوان ئــەو دوو قســـەیەت دا کــە دەڵـــێ‌ی (بزووتنــەوەی یــەکبوون نــەیتوانی ئامانجــە شــەرعی‌یەکانمان بهێنێتــەدی) پاشان دەڵێی: (ئێمە هەر کۆڕو کۆمەڵێکی ئیسلامیی مادام لەسەر ڕێبازی ئیسلام بێ بەشەرعیی دەزانین) دژایەتی‌و ناکۆکی نییە؟!!

**پرسیاری سێیەم:** بەڕێزتان هەروەك لە کۆڕێکدا لەساڵی (۱۹۹۳) باسی دیموکراسییەتتان کرد، ئێوە تا ئەو حەددە لەگەڵ دیموکراسییەتدان کە لە بەرژەوەندی خۆتاندایە بەڵام کە بەرژەوەندییە کە گەیشتە خەڵکی بەگشتی ئێوە لەگەڵیدانین. لەگەڵ ئەوەشدا دەبێ هەمووان لە دیموکراسی سوودمەند بن نەك تەنها لایەنێکی سیاسی یان چەند خەڵکانێك.

**پرسیاری چوارەم:** دەربارەی داهاتی حزبەکەتانە (کۆمەڵی ئیسلامیی) ئایا لەکوێ بەدەستی دەخەن؟!

**مامۆستا عەلی باپیر:**

**یەکەم:** ئێمە پاڵپشتی خۆمان بۆ ئەم گیان‌و ئەزموونە لەوەدا دەبینینەوە کە ئەم کیان و ئەزموونەی ئێستا هەیە ئێمە تێیدا بەشدار بووین، ئێمە لە ڕاونان و وەدەرنانی ڕژێمی بەعسیشدا بەشداربووین، هەروەها کاتێ کە ڕژێم نیازی گەڕانەوەی کرد ئێمە شەهیدمان دا لەپێشـگیری لـێکردنیدا، کەواتە ئێمـە لەبناغـەی دروست کردنـی ئـەم ئەزموونـەدا ئامادەیی مـان هــەبووەو بەشداربووین، لەدیوار دانانەکەشیدا چەندە ڕێگەمان پێ درابێ بەشداربووین واتە ئێمـە لەهـەردوو دەڤەرەکـەدا ئامادەیی‌مـان هـەبووە لەگـەڵ تێبینیشـمان لەسەر چۆنییەتی بەشداریکردنەکان، ئێستاش ئەوە ئێمە هاتووین بۆلای کاك مەسـعود و سـەرکردایەتی پـارتی پێمـان گوتـون ئـەوا ئێمـە سـەلامتان لـێ دەکەین ئێوەش وەڵامان بدەنەوە ئێمە لەدەرگاتان دەدەین ئێوەش دەرگامان لێ بکەنـەوە. ئێمـە وەك کۆمـەڵی ئیسلامیی بوونـی خۆمان و وجـودی خۆمـان وانابنین کە خـەڵك لێمـان زەرەرمـەند بێت بـەڵکو بوونـی خۆمـام وادەبینـین

کەوەك چۆن لەرابردوودا بەکەڵکی یەکترهاتوین ئێستاش بەکەڵکی یەکتر دێین دیارە(چەپڵە بەیەك دەست لێ نادرێ)و دەبێ مەجال بدرێو بەئەندازەی ئەوەی مەجالمان پێ دەدرێت لەسنووری شەرعدا هاوکاربووین لە رابردودا وەلە داهاتووشدا هاوکار دەبین .

دووەم: سەبارەت بەوەش کەوات زانیوە دژایەتییەك لە نێوان ئەو دوو قسەیەدا هەیە کە وتوومانە بزووتنەوەی یەکبوونی ئیسلامیی نەیتوانیوە ئامانجە شەرعییەکان بێنێتە دی، لەلایەکی تریشەوە وتومانە هەرکۆمەڵێکی ئیسلامیی بەشەرعی دەزانیین، بەڵام ئێمە دەڵێین: ئەو دووشتە لێك جیان، بەڵام پێکەوە دژ نین ئەوەتا ئێوە وەك پارتی دیموکراتیکوردستان بێ گومان تێبینی و گلەیی‌تان هەیە لە یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بەڵام ناڵێن نابێت یەکێتیی نیشتمانیی هەبێت پێدەچێ ئەوانیش تێبینیان هەبێ، واتە رەخنە لەکەسێك دەگریت کە ناتوانێ ئامانجەکان بێنێتە دی واتای ئەوە نییە شەرعییەتی لێ زەوت بکەی یان حەقی بوونی لێبسەنیتەوە، ئێمەش دەڵێین هەموو کۆمەڵە موسڵمانێ بۆی هەیە ئیجتهادی خۆی بکات و مومارەسەی بکات بەڵام ئەگەر نەیتوانی ئامانجەکانی بهێنێتە دی من بۆم هەیە رەخنەی لێبگرم بەڵام بۆم نییە بڵێم لەبەرئەوەی لار دەڕۆی نابێت هەبیت، بەس بۆخۆمان بۆمان هەیە لەگەڵیاندا نەبین لەکاتێکدا کە بۆچوونمان و بۆچوونیان جیایە.

سێیەم: بەنیسبەت سیستمی دیموکراسیشەوە کەگوتت ئێوە هێندە لەگەڵیدان تا لەگەڵ بەرژەوەندییەکانتاندا یەك دێتەوە، ئێمە نایشارینەوە و نەشمان شاردۆتەوە ئێمە ئەگەر دەستەڵاتمان هەبێت سیستمی حوکمڕانی ئیسلام رادەگەیەنین و هەر کۆمەڵێکی ئیسلامیی و هەر حزبێکی ئیسلامی ئامانجی دووری ئەوەیەو ئەو حوکمە ئیسلامییەش ئیجابییەکانی دیموکراسییەتی هەموو تێدایە، بەڵام سەلبیاتەکانی دیموکراسیەتی تێدا

نییە، لە دیموکراسییەتدا لەبەرئەوەی هیچ شیرازەیەك دیاری نەکراوە، حەڵاڵ و حەرام و چاك و خراپ تێکەڵ دەکرێ بەپێی میزاجی خەڵك، خەڵکی چییان پێ باش بوو دەکرێتە یاسا، بەڵام لەسیستەمی حوکمی ئیسلامیداخەڵکی هەرچی پێ باش بوو ناکرێتە یاسا، بەڵکو خوای خەڵکی چی پێ باش بوو ئەوە دەکرێتە یاساو لەبەر رۆشنایی شەریعەتدا یاساکان هەڵدەهێنجرێن، بۆ نموونە بڕیاری دابەش کردنی کوردستان بێگومان لەپەرلەمانەکانی ئەورووپادا کاتی خۆی دراوە ئایا شتێکی باش بووە؟ بێگومان نەخێر ئایا ئەگەر شەریعەتی ئیسلامیی لەوێ حاکم بوایە نەیدەگوت؛ میللەتێکی سی چل ملیۆن کەسی، چۆن دەبێ وەك گۆشتی خێر بیبەخشنەوەو ئەوە دروست نییە؟! چونکە خوای گەورە دەفەرموێ (لاتَظْلمون ولاتُظْلمون) نەزوڵم بکەن و نەزوڵمتان لێبکرێ، واتە ئەگەر ئیسلام لە ئەورووپا و رۆژئاوا حاکم بووایە رێی نەدەدا زوڵممان لێبکەن و وەك گۆشتی خێر بمانبەخشنەوە، لەپێناوی بەرژەوەندی خۆیاندا، بۆیە ئێمە لەگەڵ دیموکراسییەتداین لەلایەنە ئیجابییەکانیدا، وە خاڵی پێکگەیشتن لەنێوان ئیسلام و دیموکراسییەتدا هەیە لەخاڵە ئیجابییەکاندا بەڵام بێگومان لە خاڵە سەلبییەکاندا نا، و هیچ کەس مەترسی ئەوەی نەبێت کە ئیسلام حاکم بێت ئەوە مانای ئەوەیە ئینقلاب دەکات بەسەر خاڵە ئیجابییەکانی دیموکراسییەتدا، بەڵکو پشتگیری ئەو خاڵانە دەکات کە لەگەڵ ئیسلامدا تێك دەکەنەوە، ئێمە پێمان وانییە ئێستا لەکوردستاندا دیموکراسییەت حاکم بێت، من لێتان ناشارمەوە ئێمە دەتوانین سەدوو یەك رەخنەبگرین لەرووی مومارەسەکردنی دیموکراسییەتەوە، کوا دیموکراسییەت! ئایا فیعلەن لەهەردوو ئیدارەکەی هەرێمدا، خەڵك ئازادە لەوەی کە دەیڵێن ولەوەی دەیکەن؟ ئایا فشارو زۆر لەسەر خەڵکی نییە، ئایا هیچ فشارێك نییە لەسەر خەڵك کەچی بڵێن و کە چۆن بکەن و وانەکەن و ئەوە بڤەیە و ئەوە خەتی سوورە؟!!

ئێمە پێمان وانییە بەو شێوەیە بێ بەڵام دەبێت هەوڵ بدرێت چاك بکرێت، بەڵام بێگومان ئێمە ئەگەر ناچار بین لەوەی کە دیکتاتۆرییەت یان دیموکراسییەت هەڵبژێرین ئەوا پێمان وایە دیموکراسییەت بەحەوت ئاو شۆردراوەتەوە لە چاو دیکتاتۆرییەت. چونکە لە دیموکراسییەتدا ئەگەر حەقیقەتی هەبێت مەجالی رادەربڕین دەدرێت، بەڵام بێگومان ئەگەر لەنێوان ئیسلام و دیموکراسییەتدا سەرپشك بکرێین ئەوە پێمان وایە کە ئیسلام سیستەمی بێ هەڵەو پەڵەی خوایە بەمەرجێ وەك خۆی ئاوا پیادە بکرێت، ئەوا دیموکراسییەت تۆزی ڕێگەیشی ناشکێنێ.

چوارەم: سەبارەت بەداهاتی حزب، یەکێك لەبنەماشەرعییەکانی کارمان، (ئێمە نامیلکەیەکمان نووسیوە پێش راگەیاندنی کۆمەڵی ئیسلامیی بەناوی (بنەماشەرعییەکان و هێڵە گشتییەکانی کۆمەڵێکی ئیسلامیی رەسەن) کەیەکێك لەبنەما شەرعییەکانمان ئەوەیە) کە دەبێت لەسەر پێی خۆمان بوەستین لەڕووی ئابوورییەوەو هەر کەسێك لەڕووی ئابوورییەوە سەربەخۆ نەبێ لەڕووی سیاسییشەوە بڕیاربەدەست نابێت وەك عەرەب دەڵێن (مَنْ لایملك قُوتَه لایملك قَرارَهُ) بۆیە بەراستی ئێمە پشتمان لەسەر پیتاك کۆکردنەوە و هاوکاری خەڵکی موسڵمانە لەناوەو دەرەوەی کوردستان و بۆ ئەمەش بەڵگەو شاهیدیشمان زۆرە چونکە هەرکەسێك هاوکاری کردبێتین ئاگادار دەکرێتەوە و بەپسولە بۆی دەنێردرێتەوە، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە خۆمان بەخاوەن پشك و بەش نەزانین لەداهاتی کوردستان، چ ئەوەی لەم دەڤەرە هەیە چ ئەوەی لەولا هەیە چونکە ئێمەش خەڵکی ئەم وڵات و مەملەکەتەین و خۆشمان ئەگەر لەخەڵکی بەدڵسۆزتر نەزانین، بەنادڵسۆزتر نازانین بۆ وڵاتەکەمان و میللەتەکەمان، بۆیە لەخێرو بێریشیدا خۆمان بەخاوەن پشك و بەش دەزانین جائەوەی بماندداتێ حەقی خۆمانی پێداوینو ئەوەشی نەمەنداتێ دیارە حەقی شەرعی لێزەوت کردوین.

**تەلەفیزیۆنی مەرکەزی کۆمەڵی ئیسلامیی:**

**پرسیاری یەکەم:** ئایا کۆمەڵ چ تێڕوانینێکی بۆ گۆڕینی کۆمەڵگا هەیە؟

**پرسیاری دووەم:** ئایا ئامانج لەسەفەری ئەم جارەی جەنابتان چی بوو، هەروەها چ ئومێدێك بەمسوڵمانانی شاری هەولێر بەتایبەت دەبەخشێ؟

**پرسیاری سێیەم:** ئایا سیاسەتی شەرعی لە رووی موداراتەوە نەك موالاتەوە بەتایبەت ئەگەر مودارات بکرێت لەگەڵ حزبی نائیسلامی ئەگەر ئەویش دەسەڵاتی زیاتر بێت، چۆنە؟!

**پرسیاری چوارەم:** ئایا ئەگەرهەموو حزب و لایەنە سیاییەکان ئامادەبن بۆ لێدانی رژێمی بەغداد وەلابردنی ئایا ئێوەش هاودەنگن؟

**مامۆستا عەلی باپیر:**

**یەکەم:** سەبارەت بەتێڕوانینی کۆمەڵی ئیسلامیی تێبینی دەکەم هەندێ برادەران هەردەڵێن (کۆمەڵە)ی ئیسلامیی خۆی کۆمەڵی ئیسلامییە بزوێنەکەی نییە چونکە کۆمەڵ واتای (جماعة) و بەلاّم کۆمەڵە واتای (مجموعة)یەو بچووکترە لەکۆمەڵ، تێڕوانینیشمان ئەوەیە کە خەڵك وەکو لەسەرەتاوە باسیشم کرد دەبێ لەقەناعەتەوە بگۆڕدرێ‌و گۆڕان بەسەر بیرو بۆچوونییاندا بهێندرێ بۆیە بانگەوازو فەرمان بەچاکەو پێشگیری کردن لەخراپەو قەناعەت پێهێنانی خەڵك، بەرچاو و ڕونکردنەوەی خەڵك، ئەوە بنەماکانی کاری ئێمەیە، بەڕاستی کە ئێمە چەکیشمان بەدەستەوە گرتووە کاتی خۆی چەکمان بۆ بەرگری کردن لەکوردستان و بوونی خۆمان بووە ئێستاش کە چەکمان پێیە بۆ ئەوەمان نییە کە خۆمان بەسەر خەڵکدا یاخود بیروباوەڕی خۆمان بەسەر خەڵکدا بسەپێنین بەڵکو بۆ ئەوەی بەرگری بکەین لەبوونی شەرعییانەی خۆمان، ئەگەر نا بۆ گۆڕینی کۆمەڵ وەك پێغەمبەر‌ﷺ و هەموو پێغەمبەران، لەوخاڵەوە دەست پێدەکەین کە ئەوان لێیەوە دەستییان

پێکـردووه کـه بریتییـه لـه بـانگ کردنـی خـەڵك و تێگـەیاندنی خــەڵك و بەرچاوڕۆشنکردنی خەڵك، قەناعەت پێهێنانی خەڵك.

دووەم: سـەبارەت بـە ئامـانجی ئـەم سـەفەرەمان، ئێمـە دیدارێکمـان بـوو لەگەڵ جەنابی کاك مەسعود و برادەرانی مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستانو ئێمە بـەڕوونی قسـەی خۆمانمـان کـردو ئامـادەیی خۆمانمـان خستەڕوو، کە پێمان باشە باشترین دۆستایەتیو پەیوەندی و هاوکاریمـان لەنێواندا هەبێت، بەتایبەتی لەم بارودۆخی قەیران و گرژی و ئاڵۆزییـەی کە ئەگەری هەیە ڕووبەڕووی کوردستان و عێراق و ناوچەکەش بێتەوە، لەلایەنی جـەنابی کـاك مەسعودیشـەوەو برادەرانـی مەکتـەبی سیاسیشـەوە ئێمـە ئیجابییـەتێکی باشمـان بینـیو گفـت و بـەڵێنی ئـەوەش درا کـە کۆبوونەوەکانیش درێژەیان پێ بدرێت تاکو بەئەنجامێکی باش دەگەین، و من عـەرزی برادەرانیشم کرد کە ئەمجارە هاتووین دەمانـەوێ کـە پـەیوەندیمان لەساردیەوە بۆ گەرمیو شلبوونەوە بۆ توندو تۆڵی بگۆڕیـن، چونکـە ئێمـە وەکو بزووتنـەوەی ئیسلامی پێشوو کە ئێمـە خۆمان بـەدرێژەپێدەری ئـەوە دەزانین کاتی خۆی بەڕاستی لەگەڵ برادەرانـی پارتی دیموکراتی کوردستان باشترین پەیوەندیمان بووەو بە کەڵکی یەکتر هاتووین لەتەنگانەکاندا سوودمان بۆ یـەکتر بووەو هـاتووین کـە دووبـارە ئـەو پـەیوەندی ودۆسـتایەتییە تـازە بکرێتەوەو ئومێدی خێری لێدەکەین.

سێیەم: سـەبارەت بەسیاسـەتی شـەرعی لـەڕووی موداراتـەوە، ئیسـلام هاتووە کە سیستمی ژیان بێتو دین بۆ ژیـن هاتووەو ژینیش خوای گـەورە دەفەرموێت: ((وهو الذی خلقكم فمنكم كافر ومنكم مؤمن))، تۆیتـەوێ و نەتـەوەی کـافر هەیـەو ومسـوڵمان هەیـە کەسـانێك هــەن کەبەندایـەتی خوادەکـەن وکەسانێك هەن کەنایکەن، خوای پەروەردگار مافی ژیانی بەهەموویان داوەو هـەمووی بـۆی هەیـە بـژی، ئـەوەی ئیمـان بێنـێو ئـەوەی ئیمـان ناهێنـێ.

لەبەرئەوە لەسیاسەتی شەرعیدا مەجالێکی زۆری تێدایە وەك پێشتریش تیشکم خستەسەر لەدرێژەی مێژووی دەوڵەتی ئیسلامیدا مەگەر چۆن دەنا بار بەلای ئیسلامدا نەکەوتووە مەگەر مومارەسەی هەڵەکرابێت ئەگەر ناقەت باری دۆستایەتی و پەیوەندی بەلای دەوڵەتی ئیسلامیدا نەکەوتووە، چونکە من کە لەگەڵ ئینسانێك پەیمانێکم هەیە بائەو ئینسانە بێ بڕواو کافریش بێت لەڕووی شەرعییەوە لەبەر خوا ناچارم بەو پەیمانەوە پابەندبم لەڕووی شەرعییەوە زانایانی ئیسلام دەڵێن لەگەڵ کافردا، لەبواری هەڵسوکەوتدا دروست نییە درۆشی لەگەڵ بکەیت چ جای پەیمانی لەگەڵدا بشکێنی یان بار بەلای خۆتدا بخەی.

چوارەم: سەبارەت بەلێدانی رژێم: ئێمە هەم لەگەڵ برادەرانی یەکێتی و هەم لەگەڵ برادەرانی پارتی باسمان کردووە کە ئەگەر هەر پرۆژەیەك یان شتێکی وابوو ئێمەش خۆمان بەبەرپرس دەزانین لەو بارەیەوەو ئامادەیشمان هەیە هەرشتێك لەقازانجی وڵات و میللەتکەماندا بێت، ئێمەش لەقەدەر توانای خۆمان بەشداری بکەین، بەڵام بەمەرجێك نەکرێینە ئامرازی هێنانە دی ئامانجەکانی ئەمەریکا، چونکە بێگومان ئەوە عەیبداری دنیاو قیامەتی تێدایەو ئەوە ئیسلامی لەخۆمانی ناوەشێنینەوە.

مامۆستا شێرکۆ مەحمود لە رۆژنامەی میدیا:

لەوتارەکەدا جەنابت باسی پەیوەندییەکانت نەکرد، بەڵام دوایی لەمیانەی وەڵامی پرسیارەکاندا، ئاماژەت پێکرد، جا ئایا لەحاڵێکدا کە ئێران و پەیوەندی کردن لەگەڵ کاربەدەستانی ئێران و سەردانی کردنیان وێستگەی سەرەکی پەیوەندییەکانتان بووە:

**پرسیاری یەکەم:** ئایا لەو پەیوەندیکردنەدا هیچ جیاوازییەکتان لەگەڵ بزووتنەوەی یەکبوونی ئیسلامی پێشووتر و بزووتنەوەی ئیسلامی ئێستادا هەیە؟

**پرسیاری دووەم:** ئایا ئێران لە تێڕوانینی ئێوەدا چ پێناسەیەکی هەیەو لەخانەی دەوڵەتێکی داگیرکەری کوردستاندا دەژمێردرێ؟

پارتەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان زۆر جاران لەبەیاننامەی ڕەسمی خۆیان دا بزووتنەوەی ئیسلامی پێشوویان تاوانبار دەکرد، بەهاوکاری کردنی ئێران لەتیرۆر کردن و دەستگیرکردنی ئەندامەکانیاندا، ئایا هەڵوێستی ئێوە وەک کۆمەڵی ئیسلامیی بەرامبەر پارتەکانی کوردستانی ڕۆژهەڵات چییە؟

**پرسیاری سێیەم:** لەبارەی کێشەی نەتەوەیی ونیشتمانی کوردەوە ئامانجی دیاری کراوی قۆناغی ئێستاو ئامانجی ستراتیجی کۆمەڵی ئیسلامیی چییە؟

**پرسیاری چوارەم:** ئێوە پێش هەڵبژاردنەکانی پەرلەمان، بەماوەیەکی کەم پەرتوکێکتان بڵاوکردەوە بەناوی کێشەی کورد لەنێوان ئێمان و پەرلەماندا هەروەها لەچەند وتارێکی بەو دواییەشدا حزبە عەلمانییەکانی کوردستانتان بەحزبی ڕێباز هەڵەناساند، ئێوە ئێستا تاچەند ئامادەن بەشداری لەپرۆسە دیموکراتییەکاندا بکەن؟

**پرسیاری پێنجەم:** ڕاتان چییە دەربارەی جیهاد ڕاگەیاندنی (جند الاسلام) واتا پشتیوانانی ئیسلام لەکوردستاندا دژ بە حزبە کوردستانییەکان؟

**مامۆستا عەلی باپیر:**

**یەکەم:** بەنیسبەت ئێران، دیارە دەوڵەتێکی دراوسێی ئێمەیە، پەیوەندیشمان لەگەڵیدا پەیوەندی سیاسیی و حزبییەو پێویستیشە

پەیوەندییەك بێت كە لە قازانجی حزبیدا بێت بە ئاگادرای مەكتەبی سیاسیو شوورا بێتو كۆماری ئیسلامییش پێدەچی هەندێ گلەیی لە ئێمە هەبووبێ كەئێمە دەبووایە وابكەین و وانەكەین، ئێمە نایشارینەوە كە كۆماری ئیسلامی ماوەیەك لەگەڵ ئێمەدا هەندێك داواكارییان هەبوو بۆ نموونە دەیانگوت كە دەبێت جەنابی مامۆستا مەلا عەلی بهێڵدرێتەوە یاخود بەو شێوەیە بێ و بەوشێوەیە نەبێ، ڕاستییەكەی ئێمە ئەوەی كە خۆمان عەقڵمان نەی بڕی ڕەتمان كردەوە، بەبەڵگە و دەلیلیش و سەرئەنجام ئەوان زیاتر هاتنە سەر ئەو قەناعەتەی كەلەگەڵ ئێمەدا تەعامولی سیاسی بكەنو ئێمەش گوتومانە ئێوە چاكەتان بووە بۆ ئێمە و بۆ میللەتی ئێمەشو بۆمیللەتی عێراق ئێمە ئەو چاكەیەمان لەبەرچاوە.

دووەم: سەبارەت بەوەی كە ئایا ئێران بەدەوڵەتێكی داگیركەری كوردستان دادەنێن؛ ئێمە پێمان وانییە كۆماری ئیسلامی ئێران كوردستانی داگیر كردبێت ، بەڵكو (شا)ش كە شتێكی خراپ بوو ئەویش كوردستانی داگیر نەكردبوو بەڵكو كوردستان بەپێی پەیمانی سایكس بیكۆ داگیركراوە و كراوەتە خێرو بەخشراوەتەوە، جا ئێمە ئەو زوڵمەی كە ئینگلیز و ئەمەریكاو ڕۆژئاوو ڕۆژهەڵات لێیان كردووین بۆچی بەئێرانی فەقیری بڕێژین، ئەوكەسەی پەیمانی سایكس بیكۆی مۆركردووە هەرئەویش دەتوانێ نەخشەو سنووری دنیا بگۆڕێ ئەگەر ڕاست بكات، جابا لە ئێران بگەڕێین، ئێمە خۆمان ئازاد كردووە با دان بەم كیانەماندا بنێن ئەوكاتە دەبینی كۆماری ئیسلامی بیرێك لەوەزعی خۆی دەكاتەوە، بۆپرسیارەكەش دەربارەی پارتەكانی ڕۆژهەڵاتی كوردستان، ئێمە كورد لەهەر پارچەیەكی نیشتمانی خۆی داوای ئەوە بكات كە ئازادبێ و زوڵمی لێنەكرێ و ستەمی لێنەكرێ داواكەی بەرەوا دەزانین. بەڵام شێوەی خەباتەكەی و میكانیزمی خەباتەكەی ئەوە بێگومان جێگەی تێڕوانینە.

ئایا چۆن باشە بۆ میللەتی کوردی ئێران، ئایا دژایەتی کۆماری ئیسلامی ئێران بکەن ئایا وا باش بوو کە هەر لەسەرەتاوە لەرێی لەیەك تێگەیشتنەوە لەگەڵ ئێران دا چووبانە پێش یان لەرووی دژایەتییەوە، رەفتاری لەگەڵ بکەن؟! ئایا ئەو خەباتی رزگاری خوازییەی کە لەکوردستانی ئێراندا کرا لەقازانجی میللەتی کورددابوو یاخوود بەئیشارەت پێدانی هەندێ لەزلهێزەکان بوو وەك یەکێتی سۆڤێت و ئەوان هەروەك چۆن کۆماری مەهاباد کاتی خۆی کە دامەزرا، بێگومان وەرەقەیەك بوو بەدەستی یەکێتی سۆڤێتەوە بۆ پاڵەپەستۆ خستنەسەر دکتۆر موصەدەق و بۆئەوەی کە تەنازول لەنەوتی باکووری ئێران بکات.

ئایا ئەو خەباتی رزگاری خوازیەی ئەو لایەنە سیاسیانە کە هەبوون بەهاندەری بەرژەوەندی کورد ئەوەیان کرد یاخود زیاتر بۆئەوەی کە بەرژەوەندی خەڵکی تری پێ دابین بکری لەپشت پەردەوە ، وەکو عەرەب دەڵێت (ماوراء الكواليس).

**سێیەم:** سەبارەت بەدیاری کردنی چارەنووسی میللەتی کورد لەداهاتوو ئێستادا ئێمە پێمان وایە ئێستا لەکوردستانی عێراق دا دروشمێکمان هەڵگرتووە، پێم وایە پڕبە پێستی قۆناغەکەمانە و شتێکی باشە مەسەلەی (فیدرالیزم) فیدرالییەت بۆ کوردستان شتێکی باشەو ئێمە لەگەڵیداین پێشمان وایە کە فیدرالییەت هەر نیزامی سستمی ویلایەتە لەئیسلامدا کەکاتی خۆی ئەو وڵاتانە کە سنوورێکیان بووەو پێك هاتەی میللەتەکەیان شێوەیەك بووەو، ئیسلام کردوویەتی بەویلایەتێك و لەخۆیان (والي) و سەرپەرشتکاریان بووەو گونجاو بووە لەگەڵ سادەیی ئەو کاتەدا، بۆ داهاتووش دەکەوێتە سەرئەوەی کە کورد بزانێ بەرژەوەندی خۆی لەچیدا دەبینێ، گرنگ ئەوەیە لەرووی شەرعییەوە ئیسلام هەتا دەوڵەتی سەربەخۆی کوردی رێگا دەدات، بەڵام کورد بۆ خۆی چی بۆ دەکرێ و

بەرژەوەندی خۆی لەچیدا دەبینی ئەوە دەبێت بەمەشوەرەت و ڕاوێژی هەموولایەك بڕیاری لەسەربدرێت.

**چوارەم:** سەبارەت بەوەی تا چ ڕادەیەك لەپرۆسەی دیمکراسییەتدا ئامادەین بەشداری بکەین؟ پێشتر قسەمان لێکرد کە دیموکراسییەت ئێمە ئاواتەماشای دەکەین و لەکاتێکدا کە هەم برادەرانی پارتی و برادەرانی یەکێتی دەڵێن ئێمە دیموکراسین و ئێمەش دەڵێین با هاوکار بین و دۆستبین و ئامادەین مودارات بکەین بەشدار بین و تەعامول بکەین لەگەڵ ئەم وەزعەدا و کاتێکیش خۆمان بنکەی جەماوەری وامان بوو کە ئیسلامی ویست و دەسەڵاتمان بوو، بێگومان دەبێت خەڵك ئەوکاتە مودارات بکات لەگەڵ ئێمەدا.

**پێنجەم:** مەسەلەی(جندالإسلام) یش و (انصارالإسلام) یش پێشتر باسمان کردووە وەڵاممان داوەتەوە.

**کاك ئیسماعیل تەلەفزیۆنی یەکگرتوو:**

هەرچەندە لەئەنجامی قسەکانتدا لەوانەیە تارادەیەك وەڵامی پرسیارەکەمت دابێتەوە بەڵام حەزدەکەم. ئەوە بزانین کە ئایا کۆمەڵی ئیسلامیی لەکوردستان چی لە بەردەستدایە بۆ ئاشتەوایی سەرتاسەری کوردستان بۆ ئەوەی ئەنجامی بدات؟!

**مامۆستا عەلی باپیر:**

دیارە میللەتی کورد لێرەو لەهەر جێیەکی دیکە بەبێ ئاشتی و تەبایی و برایەتی هیچی بۆ ناکرێ لەبەر ئەوەیش خۆمان وەك لایەنێکی ئیسلامی، بایی ئەوەندەی قسەمان لێوەردەگیرێت و دەستمان کراوەبێ و مەجالمان دەبێ، بەئەرکی سەرشانی خۆمانی دەزانین کە شەڕو کێشەو دووبەرەکی دوور بخەینەوەو باروودۆخ ئارام و هێمن بکەینەوەو زەمینە ساز بکرێ بۆ

ئەوەی کە ئەو دوو ئیدارە کوردییە کە پێشتر باسمان کرد بخرێنەوە سەریەك و میللەتی کورد یەك دەنگ بێت. من لەسەفەرێك بۆ دەرەوەی وڵات لە ساڵی (٩٥-٩٦) کەبرادەرانی پارتی و یەکێتی لەگەرمەی شەڕی ناوخۆدا بوون، پرسیاریان لە ئێمە کرد کە باشە ئێوە وەکو لایەنێکی ئیسلامی لەکوردستاندا بۆ شەڕ دەکەن پێکەوە خۆ ئێوە جاران گلەییتان دەکرد لەحزبی بەعس و دەتان گوت کوردستانیداگیرکردوە، و ئێستا بۆ خۆتان وڵاتی خۆتانەو ئازادتان کردووە، بۆ شەر دەکەن بۆ پێکەوە هەڵناکەن؟!! منیش وتم ئێمەنین شەردەکەین وتیان ئەی کێن گوتمان برادەرانی یەکێتی و پارتین، گوتیان بەرپرسی پارتی کێیە گوتمان جەنابی مەسعود بارزانییە، ئەی یەکێتی؟ گوتمان جەنابی مام جەلال، وتیان ئێوە لەگەڵ کامیانن؟ وتمان ئێمە لەگەڵ هیچیاندا نین، گوتیان ئێمە ئەوە نازانین ئەوەندە دەزانین کە کورد پێکەوە بەشەردێ.

لە راستیدا ئێمە وەك ئیسلامی پێمان وایە تا ئاشتی هەبێ و تەبایی هەبێ، هێمنیی هەبێ، چاك ترە هەتا دەربارەی جەماعەتی (جند الإسلام)یش ئامۆژگاری برادەرانی یەکێتیم کردو گوتم ئەوە چییە هێندە لەراگەیاندنتاندا ئەوەندەی زەق دەکەنەوەو بڵاوی دەکەنەوەو دەزانن بەو کارەتان ناڕاستەوخۆ زەرەر لە سومعەی میللەتی کورد دەدەن؟ وتم جارێ ئێوە لەگەڵ برادەرانی پارتی زۆر خراپترتان بەیەك کردووەو پاشان ئێوە شتەکە ئەوەندە زەق دەکەنەوە، لەرێگەی راگەیاندنەکانەوە دەگاتە دونیاو خەڵك نالێ ئەوە (جند الإسلام) زوڵمی لە یەکێتی کردووەو ناوای کردووە، خەڵك چووزانێ خێلی حەمە لە کوێیەو (جند) چییەو یەکێتیی کێیە خەڵك لەدەرەوە دەڵێن میللەتی کورد پێکەوە هەڵناکەن و ئەوەتا کیان و قەوارەیەکیان هەیە کەچی یەکتر دەکوژن و یەکتر دەرەتێنن بۆیە ئەوشتانە نەگوترێ باشە بۆ سومعەی کورد خراپەو سومعەی کورد لەکەدار دەبی عەیبی خۆمان بپۆشین باشەو با لەبەر

بەرژەوەندی تەسکی حزبیو شەخصی بەرژەوندی بالای میللەتەکەمان لێ ون نەبێ، دەبێت رەچاوی بەرژەوەندی گشتی بکەیت تابزانیت لەچیدایە نەك بەرژەوەندی حزبەکەی خۆت تاوەکو ئەمریکا دواتر مەرحەبایەکی گەرم ترت بکات، ئەوە بەرژەوەندیەکی تەسکی حزبییە بائێمە تەماشابکەین خەڵك چۆن هاندەدرێ بۆئەوەی کە تۆ بەمیللەتێکی خاوەن فەهم و خاوەن ئیدارە بزانێت و هانبدرێ لەسەرئەوەی کە مامەڵەی لەگەڵدا بکات بەشێوەیەکی سیاسی نەك بەڵگەت لەسەر تۆمار بکاتو بڵێ ئەوەتا ئێوە پێکەوە مەدار ناکەن و پێکەوە ناژین. ئێمەهەربۆیە لەو ڕوانگەیەوە پێمان وایە کە ئاشتی و تەباییو هێمنی لەقازانجی هەمولایەك دایە ئێمەش وەك ئیسلامی زۆرجار گوتومانە ئێمە راوچی خراپ نین لەئاوی لێڵدا راو بکەین ئێمە وەك کۆمەڵی ئیسلامیی بەتایبەت پێمان وایە تا بارودۆخ ئارامتر بێت کە شوهەوا لەبارتر بێت پەیامو بانگەوازو پڕۆژەکانی ئێمە چاکتر جێگە دەگرن و چاکتر سەقام گیر دەبنو چاکتر سەر دەگرن .

**کاك نەبەز لە رۆژنامەی هاوولاتی:**

**پرسیاری یەکەم:** بەرێز ئێوە وەك حزبێکی ئیسلامی چیتان پێیە بۆ دۆزی میللەتی کورد؟!

**پرسیاری دووەم:** لەم سەفەرەی ئەم جارەتاندا داواتان کردووە لەپارتی بەرەسمی میزانییەتتان بۆ ببڕێتەوە؟

**پرسیاری سێیەم:** جیابوونەوەی ئێوە لەیەکبوونی ئیسلامی چ حیکمەتێکی تێدایە بۆ ئیسلامو بۆ کورد؟

**مامۆستا عەلی باپیر:**

سەبارەت بەسێ پرسیاری کاك نەبەز لەرۆژنامەی هاووڵاتی کەجاروبار هەندێ شتیش دەنووسن و گلەییان لێدەکەین هەندێ هەواڵ و زانیارییان پێدەگات کەوا نییەو بڵاویشی دەکەنەوە.

**یەکەم:** چیتان پێیە بۆ دۆزی کورد؟! پێم وایە کەتیشکمان خستە سەر ئەو مەسەلەیەو ئەوەمان پێیە کە لەشەریعەتی ئیسلامیدا جێی دەبێتەوەو کورد وەك هەر میللەتێکی تر خاوەنی کیان و قەوارەی خۆی بێت، بەڵام چی‌مان لەدەست دێ و میکانیزمەکەی چی‌یە؟ ئەوە بۆ خۆتان دەزانن کەپەیوەستە بەتواناکانمانەوەو چەندە کۆمەڵگای کوردی و میللەتی کورد فیکرو پەیامی ئێمە قبوڵ دەکات و وەری دەگرێ و لایەنەکانی تر چەندە هاوکاری دەکەن.

**دووەم:** سەبارەت بەداواکردنی پارەو ئیمکانیات لەبرادەرانی پارتی نەخێر، ئێمە داوامان نەکردووە بەڵام وەك گوتمان وەك حەقی خۆمان خۆمان بە خاوەن پشك و بەش دەزانین لەپارەو داهات و خێرو بێری کوردستان ئێمەش خەڵکی ئەم وڵاتەین و خاوەنی جەماوەرێکی فراوانیشین و خاوەنی بنکەی جەماوەری خۆمانین و ئێمە خاوەنی چەندان شەهیدی سەربەرزین، کەسوکاریان هەیە پێویستە زەوی و موچەیان بدرێتێ، کەئێمە لەوەدا بێبەشین، هەرچەندە هەندێك شت کراوە.

سەبارەت بەوەی ئێمە داوا دەکەین یا داوا ناکەین، ئەوەش پەیوەستە بەئاستی پەیوەندیەکانمان و پەیوەندی بەجۆری دۆستایەتیمان لەگەڵ برادەرانی پارتیدا هەیە کە (ان شاءالله) بەرەو پێش دەچێت ئەوکاتە دەبێت بەپێی ئەوە داوا بکەین، بێگومان بۆ خۆیان دەزانن کە بەشمان هەیە.

**سێیەم:** بۆحیکمەتی جیابوونەوەمان کاك نەبەز، باسمان کردو گوتمان ئێمە گەیشتبووینە حاڵەتی قەیران و بنبەست کەهەستمان دەکرد لەسەر

بوونی خۆمان قەرزار دەبینەوە، گەلێ شت دەگوترا شت دەکرا پەیوەندی شەخصی‌و نهێنی دەبەستراو مومارەسەی هەڵە دەکراو بێ سەرو بەریی دەکرا بۆ نموونە لەگەڵ برادەرانی یەکێتیی هەرئەوەندەمان دەزانی پێشمەرگەیەکمان سەیتەرەیەکی دادەنا، ئەوە چییە کاکە شەڕە لەگەڵ یەکێتیی، ئەوە بێسەرو بەرەیی‌یەك بوو کە دەبوو چارەسەر بکرێ، بۆیە بەدڵنیاییەوە دەڵێین: ئیعلانکردنی کۆمەڵی ئیسلامیی زەروورەتێکی شەرعی بوو کە ناچاری کردین‌و حیکمەتەکەشی ئەوەبوو کەئەو هەڵەو کەموکوڕیانەی کەهەستمان پێدەکرد چ لەڕووی تەعامولی سیاسی‌و چ لەڕووی ئیدارەی نێوخۆی حزب ئەوانە بگۆڕین بەشێوەیەکی وا کەشەرعی بێ‌و لە لای خواو پاشان خەڵکی پێی سەربەرز بین.

**کاك دڵشاد لە ڕۆژنامەی پاڵە:**

**پرسیاری یەکەم:** بەنسبەت ئەمەریکاو جەنگی دژە تیرۆرەوە بەڕێزتان فەرمووتان کە ئەمەریکا بەرژەوەندی خۆی لەپێشتر دادەنێ لەکاتێکدا ئەوە هەڵوێست‌و بیروبۆچوونی لایەنە سیاسییەکانی کوردستان نییە، بەتایبەتی پارتی دیموکراتی کوردستان کەدەڵێت ئێمە ئاقاری ئاسۆیەکی روون دەبینین لەسایەی جەنگی دژە تیرۆر کەئێستا رەخساوە بۆ کورد، هەڵبەتە ئەم قۆناغە ئێستا کە هاتۆتەدی بۆ کورد قۆناغێکی نوێترە بەڵام بەڕێزتان وابزانم لەمەودوا هەڵوێستتان جودا دەبێ، ئایا ئەوە ئەوە ناگەیەنێ کەئێوە هەڵوێستتان جودا دەبێت لەگەڵ حزبە کوردستانییەکان بەگشتی؟

**پرسیاری دووەم:** ئەو ڕێککەوتننامەیەی کەلەئێران لەسەر دەستی کۆماری ئیسلامی ئێران سازدراوە لەنێوان ئێوەو یەکێتیی نیشتمانیی‌و ئیسلامییەکاندا ئایا ئەو بەندانەی کە لەسەری ڕێککەوتوون تا چەند گەش بینن بەوەی بەندەکانی جێبەجێ بکرێ؟

پرسیاری سێیەم: هەڵوێستی ئێوە یا گروپە ئیسلامییەکان هەتا ئێستا لەمەڕ جەنگی دژە تیرۆر روون نییە لەکاتێکدا سەرکردەی رۆژئاوا کەجۆرج دەبلیو بۆشەو ئوسامە بن لادنیش رایان گەیاند کە ئەو جەنگە لایەنی سێیەمی تێدا نییە یان لەم سەنگەرەدایت یان لەو سەنگەرەدا یان دەبێت دژی تیرۆربیت یان دەبێت لەگەڵ رەوتە ئیسلامییەکان بێت، بەڵام تائێستا گروپە ئیسلامییەکانی چ لێرەو چ لەوڵاتانی دیکەش هەڵوێستیان روون نییەو لەو نێوەندەوە خۆیان هێشتۆتەوە!!

مامۆستا عەلی باپیر:

کاک شێرکۆ مەحمود پرسیارێکی کردووە سەبارەت بەو کتێبەی کە لەساڵی (١٩٩٢) بڵاوکراوەتەوە بەناوی (چارەسەری کێشەی کورد لەنێوان ئیمان و پەرلەماندا) و هەروەها لەچەند دیدارێك کە لەگەڵماندا کراون، حزبە عەلمانییەکان بەرێباز هەڵە لەقەڵەمدراون.

ئەوەی کە لەو کتێبەدا باسمان کردووە ئەگەر کاک شێرکۆ لەبیری ما بێت هەر ئەوەیە کە ئەم دواییەش تەئیکدمان کردۆتەوە ئێمە غەیری ئیسلام بەهەڵە دەزانین، نەشمان شاردۆتەوەو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: (فماذا بعد الحق الا الضلال) لەدوای حەق جگە لەگومرایی جگە لەسەرگەردانی هیچی تر نییە، ئێمە ئەوە ناشارینەوە کە جگە لە ئیسلام بەگومرایی و بەسەرگەردانی و بەسەرلێشواوی دەزانین بەڵام ناڵێین هەرچی مسوڵمان نەبوو لەهەموو شتێکدا سەرلێشێواوە چونکە جاری وا هەیە کابرا مسوڵمانیش نییە بەڵام لەزۆر شتدا دەپێکێ و شتی باشی پێیە و ناشڵێین هەرچی مسوڵمان بوو لەهەموو شتێکدا هەر رێی راستی گرتووە، جاری وا هەیە کابرا مسوڵمانە بەڵام شتی غەڵەتی هەیە بەس ئێمە دەڵێین ئیسلام هەڵەی تێدا نییە نەك بڵێین مسوڵمان هەڵە ناکات، مسوڵمانیش بەئەندازەی ئەوەی کەپابەند دەبێت بەئیسلامەوەو تەفاعول لەگەڵ ئیسلامدا دەکات و بەپێی

ئیسلام رەفتار دەکات لەهەڵە دوور دەبێ، بەڵام هەرگیز ئینسان نابێتە مەلائیکەت. سەبارەت بەپرسیارەکانی کاك دڵشادیش:

**یەکەم:** جەنگی دژە تیرۆر بە بەرژەوەندی کورد دابنرێ یاخود دانەنرێو ئەمەریکا بەرژەوەندی خۆی تێدا دێنێتەدی، ئەوە دوو بۆچوونە وەك چۆن هەر برادەرێك بۆی هەیە بڵێت من پێم وایە خێرو بەرەکەتی ئەو جەنگی دژی تیرۆرە هەمووی بەسەر میللەتی کورددا دەڕژێ منیش هەروەك کوردێك بۆم هەیە بڵێم نەخێر ئەو خێرو بەرەکەتە ئێمە ناگرێتەوەو بەوەش کەبۆچوونێکی خۆم دەخەمەڕوو ئەوە ناگەیەنێ کەئێمە دژی خەڵك‌و خاك‌و میللەتین، ئەی بۆچی ئەو دژی خاك‌و خەڵك و میللەت نەبێ کە بۆچوونەکەی دژی بۆچوونەکەی منە کەبۆی هەیە بۆچوونەکەی من راست بێت؟ ئایا کێ ئەو دادوەرییە دەکات؟! جا خۆ ئەگەر وا بکەین ئەوە وەك کۆرسمان لێدێ بۆ نمونە تیپێکی کۆرس کەیەکێکیان شتێك دەڵێت هەموویان پێکەوە دەیڵێنەوە!! نەخێر دەبێ جۆراوجۆری هەبێ‌و گوێ بۆ یەکتر گرتن‌و لەیەکتر حاڵیبوون هەبێ. لەوەدا بەڕاستی ژیان بەرەو پێش دەچێ‌و کۆمەڵگا جوان دەبێ وە لەوەشدا ئیبداعات دەبێ، بەڵام یەکێکمان شتێکی گوت هەموومان وەك ئەو بڵێینەوە، بێگومان ئەوکاتە راستیش ناکەین، چونکە لەحاڵێکی وادا ئەو کۆڕسە زۆریان لەترسان دەیڵێنەوە یان لەبرسان بۆ نموونە ئەمەریکا شتێك دەڵێ هەموومان بڵێین ئەمە حەقە ئەوە بەڕاستی بەس لەترسانە ئەگەر نا باشە چەپەکانی کوردستان کەدونیا پڕە لەچەپ‌و دەیانگوت ئەمەریکا هەر شەیتانێکی رەجیمەو بەکەڵکی هیچ شتێك نایەت‌و جیهانی سەرمایەداری دەبێ هەر فڕێ بدرێتە بەحرەوە، زۆر چاك لەبیرمە چەندجار موناقەشاتمان کردوە لەگەڵ چەپەکاندا ئەی باشە ئێستا واتای چی خەڵك بۆتە ئەمەریکیو لەگەڵ قەناعەت‌و بۆچوونی خۆیدا راست ناکات بەڵام بەپێی ئەو بایەی کە لەئەمەریکاوە دێت شەنی خۆی دەکات! من دەڵێم ئینسان نابێت لەکوێوە

باهات لەوێوە شەنی خۆی بکات دوایی خەرمانەکەت خراپ لێتێکەڵ دەبێ!
کەواتە ئێمەش بۆمان هەیە بڵێین ئەمەریکا بەرژەوەندی خۆی دێنێتە دی بەڵام جاری وا هەیە ئەمەریکا دەیەوێت بەرژەوەندی خۆی بێنێتەدی بەڵام تۆش دەتوانی قازانج بکەی ئەگەر بایەکەی کەدێ بەئاڕاستەیەك هات کە کەشتییەکەی تۆ بەرەو ئامانج بەرێت، لێرەدا قازانج دەکەی، بەڵام وانەزانی ئەو بۆ تۆی دەکات، ئەگەر بۆتۆی بکات کاتێکی تر دەیکرد کە کورد خەریك بوو قەلاچۆ دەکراو جینۆساید دەکرا، ئەگەر بۆ تۆی بکردایە ئەوکاتە دەیکرد.

دووەم: سەبارەت بەرێککەوتننامەی تاران و بەندەکانی تا چ رادەیەك گەشبینن جێبەجێ بکرێن؟ ئێمە هەر شتێ ئیمزا بکەین بەڕاستی بۆیە ئیمزای دەکەین چونکە قەناعەتمان پێیەتی و بەچاکی دەزانین و دەشمانەوێ جێبەجێی بکەین، لەلایەنی خۆمانەوە پێمان وایە بەهەمان شێوە برادەرانی یەکێتیش بەقازانجی خۆیانیان زانیوە بۆیە ئیمزایان لەسەر کردووەو ئومێد دەکەین ئەوانیش هەر پێوەی پابەندبن.

سێیەم: کاك دڵشاد ئەوەی تۆ دەیڵێیت پێم وایە جۆرێکە لەحەق لەخەڵك زەوت کردن مافی دەربڕین و ئازادی بیروڕا لەخەڵك داگیرکردن، لەگەڵمی یا دژمی؟ ئەوەی لەگەڵم نەبێ دژی منەو من لەگەڵ تۆنیم و لەگەل ئەویشدا نیم و لەونێوەندەدا هەڵوێستێکی دیکەم هەیە (نە ڕۆژهەڵات و نەرۆژئاوایەو ڕاستە شەقامی خوایە) مەرج نییە من یان وابم یان ئەبم چونکە خۆ ڕەنگەکان تەنها سپی و ڕەش نین مۆریشی هەیەو قاوەیشی هەیە، پەمەیش هەیە، جۆرەها ڕەنگ هەیە لەبەرامبەر شتەکاندا جۆرەها هەڵوێست هەیە، کەواتە من پێم وایە ئەوە جۆرێکە لەخۆسەپاندن و حەق لەخەڵك زەوت کردن کە خەڵك نەوێرێ هەر بڵێن ڕەئیشم وایە، چجای مومارەسەشی بکات! من پێم وایە ئەمەریکا ئەگەر لەگەڵ دروشمی دیموکراسییەتدا ڕاست بکات دەبێ بڵێ ئەوە

بیروباوەڕی خۆمەو سیاسەتی خۆمە، ئەو خەڵکەکە لەگەڵمدایە ئەوەیشی لەگەڵمدا نییە جا دژمە یاخود سیاسەتێکی تر یان هەر بۆچوونێکی تری هەیە، ئازادە ئەگەر راستیکات دەبێت وا بێ، نەك بڵێت هەرکەسێك لەگەڵم نەبێ دوژمنمەو حەتمەن جەزرەبەشی دەدەم! ئەوە بێگومان ناحەقییەکە، جائەگەر ئەو ناحەقییەشمان لێبکات و دەسەڵاتمان نەبوو، بەهەرحاڵ گرنگ ئەوەیە بۆ خۆمان نەچین تەسلیمی بین و نەیسەلمێنین. چونکە ئەگەر دەسەڵات هەبوو زوڵمیش دەکرێت، بەڵام گرنگ ئەوە تۆ زوڵمەکەی ئەو بەهەق و رەوا نەزانی و بۆی رەشەرع نەخەیت!!

**کاك ئاسۆ لە رادیۆی دەنگی یەکگرتوو:**

**پرسیاری یەکەم:** ناوچەی هەڵەبجە لەباری ئاسایشەوە ئێستا چۆنە لەرەهەندی نێوان بزووتنەوەو کۆمەڵ؟

**پرسیاری دووەم:** قەزییەی هاوکاری ئیسلامی گەیشتە کوێ و لەچ ئاستێکدایە، گەرموگوڕی ماوە یاخود سارد بۆتەوە؟

**مامۆستا عەلی باپیر:**

**یەکەم:** سەبارەت بەئارامیی لەناوچەی شارەزوور و هەڵەبجە سوپاس بۆ خوا کە بەجێمان هێشت پێش ئەوەش هەروەها لەدوای ئەوەی کە (انصار الإسلام) خۆیان راگەیاند وەك حزبێکی تازەو لەگەڵ یەکێتیی دانیشتنیان کردووە لەوکاتەوە ئەوان خۆیان یەك لایەنە تەقەو شەڕیان راگرتووە لەگەڵ یەکێتیی دانیشتن و کۆبوونەوەیان هەیە، ئێمە نازانین بەچی دەگەن ئایا یەکێتیی نیشتمانیی چۆن هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا دەکات بەڵام ئێستا بارودۆخ ئارامەو پێشم وایە هەردوولا رەنگە دەرس و پەندیان وەرگرتبێ و لەوەدا گەیشتینە قەناعەت کە ئەگەر بەزمانی گفتوگۆ یەکتر بدوێنن و کێشەکانیان چارەسەر بکەن باشترە وەك لەزمانی چەك، بەنیسبەت ئێمەو

بزووتنەوەشەوە ئێمە لەگەڵ جەنابی مامۆستا مەلا عەلی هیچ کێشەیەکمان نییە هەندێك شت هەبوو کەوتوبووە لای ئەوان، نەفەریان لەئێمە کوشتبوو، خوێنەکەیانداوەو هەندێ شتی تر هەبوو وتمان با ئەوانە دووبارە نەبنەوەو بڕیار درا کە دووبارە نەبنەوە لەگەڵ مامۆستا مەلا عەلیو ئەوانیش هیچ کێشەیەکمان نییە.

**کاك ئاسۆ: ناوچەی دەسەڵاتەکان تێکەڵن؟**

**مامۆستا عەلی باپیر:** نەخێر تاڕادەیەك ناوچەی دەسەڵاتەکان لەیەك جیان ئێمەو جەنابی مامۆستا مەلا عەلی رێککەوتنمان هەیە کەناوچەکانمان لەلای هەڵەبجەو سیروان هاوبەشەو پێکەوەین بەنیسبەت برایانی (انصار الإسلام) شوێنەکەیان تۆزێك لەهی ئێمە جیایە هەرچەند بەپێی ئەو رێککەوتنەی کە ساڵی (٩٧) لەگەڵ یەکێتیی نیشتمانیی کردوومانەو راستییەکەی کەئێمە خۆشمان بەدرێژەپێدەرو میراتگری شەرعی بزووتنەوە دەزانین ئەو ناوچانە زیاتر بەهی خۆمانی دەزانین، بەڵام بەهەر حاڵ ئێستا ئەوە گرفتێکە لەنێوانی یەکێتییو (انصار الإسلام)دا هەیەو دوای ئەوەی ئەو کێشەیە چارەسەر دەبێ، لەرووی جوگرافییەوە وەزعەکان دەچنەوە باری ئاسایی خۆیانو یەکێتیی هێزەکانی خۆی دەکێشێتەوە.

دووەم: پرۆژەی هاوکاری ئیسلامی کەلەنێوانی کۆمەڵی ئیسلامیی و یەکگرتووی ئیسلامیدا هەیە تائێستا چەند کۆبوونەوەیەکیان کردووەو ئومێد دەکەین کەبگەینە ئەنجامی باش لەگەڵ ئەوانو لەگەڵ باقی مسوڵمانان لەگەڵ مامۆستایان لەگەڵ ئەهلی تەریقەت لەگەڵ هەر کەسێك کە دڵسۆزە بۆ خەڵكو خاكو میللەت، ئێمە ئامادەین هەر جۆرە هاوکارییەکی یەکتر بکەین.

**کاك بەختیار لە تەلەفزیۆنی هەرێم:**

هەرچەندە کاتەکە زۆری خایاند بەڵام دانیشتنەکە لەگەڵ مامۆستادا زیاتر گەرموگوڕی داوە بەدانیشتنەکە.

**پرسیاری یەکەم:** جەنابتان زۆر باسی ئەوەتانکرد کەوا قورئانی پیرۆزو سوننەت دەتوانن وەك حوکم رانێك بن، وەك جەنابت باست کرد لەبارەی دەوڵەتی ئیسلامییەوە هەر لە زەمانی پێغەمبەر هەتا گەیشتە ئەمەوییەکانو عەبباسییەکانو عوسمانییەکان.

ئێمە دەمانەوێت ئەو پرسیارە ئاڕاستەی جەنابت بکەین ئێستا زۆرێك لەدەوڵەتان دەبینین کەبەپێی خۆیان بەپێی شەرعی ئیسلام دەڕۆن بەڵام هیچیشیان لەواقعی ئیسلامییەوە زۆر نزیك نینو واتا دەوڵەتەکان نەیانتوانیوە سەد دەرسەد لەسەر قورئانی پیرۆز یاخود لەگەڵ سوننەتی پێغەمبەردا هەنگاو بنێن گەر ئەو دەوڵەتانە وان بۆچی ئێمە کاتێك لەسالانی هەشتاو هەشت (٨٨) کەئەگەر سی ساڵ خەبات باس نەکەینو تەنها باسی ئەو رۆژانە بکەین کە جینۆسایدەو ئەنفال کراین، بۆ هیچ هەڵوێستێك نەبوو ئەو دەوڵەتانەی کەئەمڕۆ ئێوە بەدۆستیان دەزانن بۆچی لەو سەردەمانەدا هیچ هەڵوێستیکیان نەبوو نمونەی دەوڵەتێکی زیندوومان بدەنێ لەوانەیە بڵێن دەوڵەتەکەی سۆدان عومەر حەسەن بەشیرە کەچۆن حەسەن تورابی تێك شکاند من ئەو پرسیارەمان هەیە کە دەوڵەتێکمان پێبڵێیت کەئیمڕۆ بوترێت دەوڵەتێکی ئیسلامی هەیەو توانیویەتی شەریعەت جێبەجێ بکات کە من پێم وایە دەوڵەتێ نییە.

**پرسیاری دووەم:** سەبارەت بەوەی کەوا جەنابت زۆر لەمەوزوعی تیرۆرو ئیرهابدا وەکو بڵێین تەحەفوزێکت پێوە دیارە ئێمە دەمانەوێت ئەوە بڵێین لەهەولێری پایتەختدا لەشارەکانی تری کوردستانا زنجیرەیەك کاری ئیرهابی تێزاب رژاندنو ئافرەت کوشتنو قەتڵو عام و تەقینەوەو هەموو ئەمانەش

ئاشكران لەلایەن دەزگاكانی ئاسایشی حكومەتی هەرێمی كوردستانەوە لەكەناڵەكانی ئاسمانی كەناڵی ئاسمانی كوردستان هەمووی پەخش كران و كە تاوانباران سەر بەگروپی ئیسلامی بوون، جەنابتان راتان لەو بارەیەوە چییە؟

پرسیاری سێیەم: مامۆستا كرێكار لەرۆژنامەی هاووڵاتی ئوسامە بن لادن بەتاجی سەری مسوڵمانان دادەنێ ئەی بەرێزتان ئوسامە بن لادن بەچی سەیر دەكەن؟

مامۆستا عەلی باپیر:

یەكەم: بەنیسبەت ئەوە كە زۆر لە دەوڵەتان بەپێی شەریعەتی ئیسلامی بەڕێوەدەچن كەچی هەڵوێستیان بەرانبەر بەمەینەتی و گرفتەكانی كورد نەبوو، بەوشێوەیە نییە كەزۆرێك لەدەوڵەتان بەپێی شەریعەتی ئیسلامی بەڕێوەبچن بەڵكو زۆرێك لەدەوڵەتان تەنها دروشمی ئیسلامییان بەرز كردۆتەوە، چونكە بەڕێوەچوون بەپێی ئیسلام تەنها دروشم و ناو نییەو كۆمەڵێك بنەمای هەیە كە یەكێكیان شوورایە، واتە دەبێت خەڵك ئەو حاكمە هەڵبژێرێ، زۆرێك لەوانەی جەنابت لەهزرتدا هەبن هەموو میراتیەو بابی دەمرێ و كوڕ لەجێگەی دادەنیشێ كەواتە شوورایی نییە بەڵكو میراتییەو حوكمی میراتیش لەئیسلامدا شتێكی مەرفوزە، بەڵێ ئەمەوی و عەباسییەكان دایان هێنا بەڵام هیچ پەیوەندی بەئیسلامەوە نییەو شتێكی خێزانی و خانەوادەیی بووەو بەرژەوەندی ئەو عەشیرەت و بنەماڵەیە لەوەدا بووە، یەكێكی دیكە لەبنەماكانی حكومەتێكی ئیسلامی سەربەخۆییە (الإستقلالیة) پێم بڵێ كام لەو رژێمانە سەربەخۆیە؟ هەڵبەتە بەئیستسنای كۆماری ئیسلامی ئێران كەوا دیارە لەرووی سیاسییەوەو لەرووی بڕیاری سیاسییەوە سەربەخۆیە، لەبەرامبەر بڕیارەكانی ئەمەریكاو رۆژئاوادا دەوەستێت و ئەوە دیارە، بەڵام ئەوانەی دیكە هەموویان گوێ لەمستی ئەمەریكان، دەوڵەتێكیش

ناتوانێ ئیسلامی بێت تاکو خاوەنی بڕیاری خۆی نەبێ، پاشان یەکێکی دیکە لەبنەماکانی دەوڵەتی ئیسلامی جێبەجێ کردنی دادگەریی کۆمەڵایەتییە، خەڵك زوڵمی لێنەکرێ چینایەتی نەبێ لەڕووی کۆمەڵایەتی و ئابووری و فەرهەنگی و نەتەوەییەوە ئێمە ئەگەر بەو پێوانە هەڵیان بسەنگێنین بێگومان بەوشێوەیە دەرناچن، ئەوەی کەجەنابت فەرمووت بۆچی هەڵوێستیان نەبووە بۆ کورد بۆیە هەڵوێستیان نەبووە چونکە ئیسلامی نەبوون، من لەکتێبەکانی خۆمدا زۆرجار وتومە، مەزڵومییەتی کورد لەمەزڵومییەتی خەڵکی فەلەستین کەمتر نییە بەڵکو زیاتریشە چونکە فەلەستینییەکان ڕەنگە دە پانزە ملیۆنێك بن بەڵام کورد سی چل ملیۆنەو پاشان فەلەستینییەکان ئەگەر فەلەستینیشیان نەبێت شوێنی دیکەیان هەیە بۆی بچن، بەڵام ئێمە هیچ شوێنێکمان نییە. لەبەرئەوە کێشەی کورد لەڕووی مەزڵومییەتەوە بەهاوتای کێشەی فەلەستینیو بەڵکو بەقورستریشی دەزانین. زۆر کێشەو موناقەشاتو مشتومڕمان هەبووە لەگەڵ ئیسلامییەکاندا بەتایبەتی ئیسلامییەکانی تورکو فارسو پاکستانیو عەرەبو ڕەخنەشمان لێگرتوون، دوای ئەوەش کێشەکەمانمان روون کردوونەتەوە، هەبووە گریاوەو وتویەتی نەمان زانیوە چونکە کورد ڕاگەیاندنێکی نەبووەو کیانێکی نەبووە دیفاع لەخۆی بکات ئەوە یەك، دووەم: پەنابردنی کوردیش بۆ ئەو ڕێچکەو بیردۆزانەی کەخۆتان دەزانن لە ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاواوە هاتوون ناوی کوردیان بەد کردووە، من قەناعەتم بەوە بۆ پێنەدەهاتن کەمیللەتی کورد مسوڵمانەو کوردستان پڕ لەمزگەوتو مەلایە، دەیانوت ئەی بۆچی شۆڕشەکەی لەسەر بنەمای مارکسییەتو لینینزمو کۆمۆنیزمو ماویزمە؟! منیش دەموت ئەوە لەڕووی ناچارییەوەیە، وەك کورد دەڵێ (ئینسان بە ڕووبارێکدا چوو دەستی بۆ پوشێش دەبات)، قەزییەکە ئەوەیە کە خەڵك عاشقی مارکسیزم کۆمۆنیزم نییە بەڵکو عاشقی ئازادییە.

دیاره ئێمەش وەك ئیسلامیو وەك مسوڵمانو كادیرانی ئیسلامی دەبێ دان بەو راستییە تاڵەدا بنێین كەئەوكاتە ئێمەش لەو ئاستەدا نەبووین پێش خەڵك كەوینو خەڵك پەنای بۆ شتی تر بردووە.

بەنیسبەت نمونەیەكی زیندوو ئەوەی كەفەرمووت سودان، ئێمە تێبینیمان هەیە لەسەر سودان بەڵام من كاتی خۆی لە ساڵی (١٩٩٦) چووم بۆ سودان من ئێستا ناتوانم لەو گۆڕانكاریانەدا عومەر حەسەن بەشیر چۆنو بۆچی حەسەن تورابی وەلا خست، قسە بكەم، هەندی لەئیسلامییەكان وای لێك دەدەنەوە ئەوە شتێكی نێوان خۆیان بێ بۆ بیانوو برینی ئەمەریكاو رۆژئاواو بۆئەوەی دژایەتی سۆدان نەكەن، بەهەرحاڵ ئێمە هەمیشە وتومانە ئیسلام راستەو بێ هەڵەیە بەڵام مسوڵمان دەگونجێ راستبێو دەگونجێ هەڵەبێ، ئنجا هەروەك چۆن دەوڵەتێكی ئیسلامی تەواو عیاریشمان نییە دەوڵەتێكی دیموكراسی تەواو عیاریشمان هەر نییە، دەتۆش دەوڵەتێكم بۆ بێنەوە دەوڵەتێكی دیموكراتی تەواو عیار بێت! دیارە جیهانی ئیسلامیش پاش رووخانی كیانی خیلافەت لەسەر دەستی كەمال ئەتاتوركو بەپیلانی ئیمپریالیزمی جیهانی ئیسلامی بەراستی خۆی نەگرتۆتەوەو خۆتان ئاگادارن لەرووی شەرعەوە دەبێت مسوڵمانان یەك دەوڵەتیان هەبێتو دەوڵەتێكی سەربەخۆ و دەوڵەتێكی فراوان، هەر میللەتێك لەشوێنی خۆیدا كیانو بوونی خۆی هەبێتو سەر بەو دەوڵەتە مەركەزییە بێت كەئەوە بێگومان نییە.

دووەم: تەقانەوەكانی هەولێر كاك بەختیار رەنگە ئێوەش ئاگادار بن خەڵكێك بەناوی ئەوەی كە شتی تەقاندۆتەوە لەهەولێر گیراوە، من ئەمجارە داوام لەبرادەرانی پارتی كرد وتم ئەوانەی كەسەر بەئێمەبوونو سەر بەبزووتنەوە بوون ئێمە ئێستا لەكۆمەڵی ئیسلامین ئەوانەی سەر بەئێمەن ئینتیمایان بۆ ئێمە هەیە بیان هێننە سەر تەلەفیزیۆنو دادگاییەكی رەسمیو

دادگەرانەیان بکەن ئەگەر شتیان لەسەرە بادیار بێ ئەگەر لەسەریشیان نییە بەریاندەن، ئێمە ئەوە دووبارەی دەکەینەوە ئەگەر برادەرانی یەکێتیی خەڵکیان گرتووە بەو تۆمەتەوە، وە برادەرانی پارتی خەڵکیان گرتووە با بێن دادگاییەکی دادگەرانە یان بکەن و خەڵك ببینێ، کاتی خۆی کادێرێکی پارتی گیرا لەئێران، بەرپرسێکی[٣] پارتی وتی: ئەو ئیعتیرافانەی کە کردوویەتی بەزۆر پێی کراوە، کەواتە هەمان قسە دەگونجێ بۆ ئێرەش بگوترێ، ئیسلامییەك بۆی هەیە بڵێ ئەو برایە بەڵێ ئەو ئیعترافانە دەکات بەڵام بەزۆرە ئەگەر بەزۆر نییە با خەڵکێك بێت ببینێ دادگاییەکی ئاشکرا بکرێ، باتەماشای شەریعەتی ئیسلامی بکەین من زۆرجار ئەوەم بەبرادەران وتووە کە دروست نییە لەڕووی شەرعییەوە قومبەلەیەك یان (TNT)یەك دابنێی لەشوێنێکدا نەزانی بەکێدا دەتەقێ، دروست نییە جارێ لەکاتی جەنگیشدا دروست نییە خەڵکی کەبەشدارنین لەجەنگدا بکوژی، خەڵکی مەدەنی دورست نییە بکوژرێن، لەفەرمایشتەکاندا هاتووە کە کرێکارو پیرەمێردو ئافرەت و منداڵ و ئەوانەی راهیبن نابێ بکوژرێن، دەبێت تەنها خەڵکی جەنگاوەر بگوژرێن (وقاتلوا في سبيل الله الذين يقاتلونكم ولاتعتدوا) موفەسیرین دەڵێن کەمانای ئایەتەکە ئەوەیە کە لەگەڵ ئەوانە بجەنگن کەلەگەڵتاندا دەجەنگن دەست درێژی مەکەن واتا خەڵکێك مەکوژن کەلەگەڵتان ناجەنگێن، چجای کەشەڕیشت نەبێت لەناو خەڵکێکدا تۆزێ (TNT) لەشوێنێکدا دابنرێ نازانی بەکێدا دەتەقێتەوە، ئەوە شتێکی ناشەرعییە من پێم وا نییە ئەوانە خەڵکی ئیسلامی کردبنی یا مسوڵمانێکی ناحاڵی کردوێتی یاخود خەڵکێکی دیکە کردوێتی، ئێمە دوژمنمان زۆرە، چەند جار پارتی خەڵکی گرت بە (TNT)یەوە کە لەلایەن رژێمەوە نێردرابوون، پاشان بۆ دەبێ یەکسەر بخرێتە سەر ئیسلامییەکان ئەگەر راستیشە

---

[٣] کاك (فاضل میرانی) کە ئەوکاتە وەزیری نێوخۆ بوو.

ئیسلامییەکانن، دەڵێین فەرموون ئەوە دادگا ئاشکرابێ ئەوە حەقی خۆمانە داوای بکەین نەك سێ ساڵ کەسێ شوێن بزر بکرێ نەزانی لەسەرچی گیراوە کەسوکارەکانیان دێن بۆلای ئێمە ئەو رۆژە بەبرادەرانی پارتیم وت: کەسوکاریان دێن هەڵم دەپێچن دەڵێن ئەگەر کورەکەمان شتێکی لەسەرە بابزانین پەرۆشمان نابێت ئەوکاتە ئەگەر غەڵەتێکی کرد بێت، بەڵام ئەگەر هیچی لەسەر نییە بۆ بگیرێ بابزانین داخۆ چی لەسەرە ئەوە حەقێکە ئێمە لەڕاستیدا داوای دەکەین.

سێیەم: بەنیسبەت ئوسامە بن لادن کە مامۆستا کرێکار دەڵێت تاجی سەری ئوممەتی ئیسلامە، ئێمە تەنها پێغەمبەر ﷺ بەتاجی سەری ئوممەتی ئیسلامی دادەنێین، ئوسامە بن لادن مسوڵمانێکە بۆخۆی پرۆژەیەکی هەیەو هەندێ کار دەکات، چەندەی پێکاوە چەندەی نەپێکاوە ئەوە جێگەی مشتومڕە جێگەی ئەوەیە هەڵبسەنگێنرێ، بەڵام ئێمە بێجگە لە پێغەمبەر ﷺ کەس بەتاجی سەری ئومەتی ئیسلام نازانین.

دووبارە سوپاستان دەکەین کەئامادەبوون یاخوا بەخێربێن هیوادارین کەشتێکی وامان نەوتبێت دڵی کەس گەرد بگرێت، دڵتان پێی ناڕەحەت بووبێت، هیواداریشم هەموو لایەکمان هەر قسەو بۆچوونێکی راستو دروست بەسینگی فراوانو خۆشحاڵییەوە لەخاوەنەکەی وەربگرین.

ئەم بەرهەمانەش لەژێر چاپ دان:

١- جیهاد لەرێی خوادا چییەو بۆچی دەکرێ و چۆن دەکرێ؟

و

چەند قسەیەکی دڵسۆزانە لەگەڵ حوکمڕانانی کوردستان دا

٢- زانایانی ئیسلام کێن و چۆنن؟! چاپی دووەم

٣- گەڕانەوە لای خوا چاپی دووەم

## نێوەڕۆکی بابەتەکان



ئێمە وەك كۆمەڵێكی ئیسلامیی كە لەنێو ساحەی كوردستاندا كاردەكەین حەز دەكەین زیاتر خۆمان بە خەڵك بناسێنین وەك خۆمان نەك لە دەمی خەڵك و لە روانگەی قەڵەم و پێناسەی خەڵكی ترەوە، خەڵك لەدەمی خۆمانەوەو لە روانگەی خۆمانەوە بمانناسێت كە بێگومان ئەوە حەقیقەتی ئێمە دەبێت كە دەكەوێتە بەرچاویان نەك ئەوەی كە بە چاویلكەی خەڵكیتر یا لە پشت پەردەی خەڵكیتر سەرنجمان لێبدەن، رەنگە شتێكی تری بكەوێتە بەرچاو، دەشمانەوێت هەڵوێست و ئامانجی خۆمان و بیروبۆچوون و تێڕوانینی خۆمان سەبارەت بەو بابەتانەی كە جێگەی مەبەستمانن وە پەیوەندییان بە هەموومانەوە هەیە بخەینە ڕوو.

ژمارەی سپاردنی (٩٥)ی ٢٠٠٢ی وەزارەتی رۆشنبیری پێدراوە